

(گەنجینەیەکی شاراوە)

# مەلاڕەئووفی خادم سوجادە

(١٨٧٠-١٩٤٣)کـــــــۆیە

**رەهبەر سەید برایم**

**کـــوردستان - ٢٠٢٣**

**ناوی کتێب: (گەنجینەیەکی شاراوە) مەلاڕەئووفی خادم سوجادە (١٨٧٠-١٩٤٣)کۆیە**

**ئامادەکردنی: ڕەهبەر سەید برایم**

**تایپ: سەرمەد سەلاح سابیر**

**دیزاین: باوان محەمەد سدیق**

**چاپ: چاپخانەی ڕۆژهەلات-هەولێر**

**تیراژ: ١٠٠٠ دانە**

**ساڵی چاپ: ٢٠٢٣**

**نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم**

لە بەڕێوەبەرێتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردنی (  ) ی ساڵی ٢٠٢٣ ی پێدراوە

# کلیل بۆ سوپاس و باس:

بۆ کتابی گەنجینەیەکی شاراوە مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە (١٨٧٠-١٩٤٣) کە کەسایەتییەکی گەورە و عاشق و ئاینی و نیشتمانی بووە سەرچاوەی کتابەکەمان (دیوانی ڕەئووف) (مەلا ڕەئووف خادم سوجادە) (١٨٧٠-١٩٤٣) بووە، پێشەکی و توێژینەوە و ساغکردنەوە (د.کەمال غەمبار)- لێکدانەوە و شەرحی شیعرەکان (فەرهاد عەزیز خۆشناو) بووە لەگەڵ پشت بەستن و بە زانیاری دیکۆمێنتی بەڕێز (ئەمەل سەعدی خادم سوجادە)، بۆ ئەم مەبەستە لە ڕۆژمێژووی ٢٠٢٢/٦/٢٩ لە کتێبخانەی گشتی حاجی قادری کۆیی کۆڕێك سازکرا دەربارەی مەلا ڕەئووف خادم سوجادە لەو کۆڕە دا کرۆکی ئەو نوسینەم باسکرد و هەر لەوێش بۆ ڕێزگرتن و پاراستن و چاپکردن و پێداچوون و لێکۆڵینەوە گوڵبارانی د.کەمال غەمبار کرا: ڕێزی لێندرا و سوپاس کرا، جگەلەوەش سوپاسی بێ پایانی مامۆستا عوسمان موفتی بە تایبەت لەگەڵ مامۆستا سەعید عەبدوڵڵا سامی فەخری کچەزای مەلا ڕەئووفی خادم سوجادە و سەرمەد سەڵاح سابیر و هونەرمەند وخۆشنووس مەحمود خۆشناو و باوان محەمەد سدیق دەکەین ماندووبوون و شەونخوونیان کرد بە تایبەتی خزمی دەخۆن کاك سەرمەد پشکی پیاوەتی زۆر بەردەکەوێ بۆ ئەو بەرهەمە.

**(ڕەهبەر سەید برایم)**

**٢٠٢٣/٤/٢٤**

# وتەیەکی پێویست

## ئەمەل سەعدی خادم سوجادە

من لێرەدا دەمەوێ زۆر بە کورتی سەرە قەڵەمێك بنووسم سەرەتا بۆ ستایشی برای بەرێزمان کاك ڕەهبەری سەید برایمی بەرزنجی لە شاری باب و باپیرانم کۆیەی خۆشەویست.

ناوی تەواوم (ئەمەل سەعدی مەلا ڕەئووف خادم سوجادەیە) لە ساڵی ١٩٤٠ لە کۆیە لە دایکبووم دڵداری مامم ناوی نابووم (هیوا) تاکە کچیش بووم ناوم هیوا بێ دواتر کە باوکم و مامم ئاسەف و دڵداری مامم لەلایەن دەوڵەتەوە گیرابوون لە ماڵەوە دایکم ناوی کردمە (ئەمەل) لەبەر زروفی سیاسی عائیلەکەمان کە لە ژێر چاودێری توندی پیاوانی دەوڵەت بووین بەو هۆیەی کە عائیلەکەمان دەستیان لە سیاسەت و کوردایەتی و دامەزراندنی حزب هەبووە.

مەلا ڕەئووفی باپیرم جگە لەوە لە شەریعەتی ئیسلام زۆر شارەزا بوو، دەستێکی باڵای هەبوو لە شیعر و ئەدەب، حقوقی لە ئیستەمبوڵی تەواو کردبوو کەسێکی زۆر کوردپەروەر و نیشتمانپەروەر بوو زۆر دڵخۆشم کە بەڕێز کاك ڕەهبەر بەرزنجی ئەم بەرهەمەی لەسەر باپیرەم و بنەماڵەکەمان نوسیووە بە تایبەتی مەلا ڕەئووفی خادم سوجادە.

قسەکانی سەعدی باوکم باش لەبیرە کە باسی دەکرد دەیگووت مەلا ڕەئووفی باوکم پێوەندیەکی بەهێزی لەگەڵ منداڵەکانی خۆی دا هەبوو سوحبەت و قسەی خۆشی لەگەڵمان دادەکرد، بۆ زۆر شت و کاروبارەکانی خۆی مشاوەرەی جددی لەگەڵ زەینەب خانی خوشکم دادەکرد بۆ پرسی کۆمەڵایەتی و هەتا سیاسی و کشتوکاڵی و ئەدەبیاتیش، ژنهێنانی هەموومان زەینەب خانی لە پشتبوو.

باپیرم مەلا ڕەئووف زۆر نەهامەتی و دەربەدەری دیبوو، شەونخونی زۆری بۆ کورد کێشاوە و دانەنیشتووە بەردەوام لە هەوڵی ئەوە دابووە کە کیانی

بۆ کورد دروست بێت و کورد خاوەنی دەوڵەتی خۆی بێت جگە لەوێ لە ئەستەنبوڵ خوێندیەتی و سەردانی ئەم شوێنانەی کردووە (لوبنان، شام، ئەستەنبوڵ، فەرەنسا، سۆڤێتی کۆن، ئێران، قاهیرە) ئەمانە هەمووی بۆ قەزیەی کورد بووە، کاتێ ئینگلیزیش هاتووە باپیرەم خۆی شاردۆتەوە تا مردیش هەر دژیان بووە.

سەعدی باوکم لە باسی مەلا ڕەئووفی باوکی دەیگووت زمانەکانی (ئینگلیزی، عەرەبی، تورکی، فارسی، یۆنانی، هەندێ ئەڵمانی دەزانی) زەکاوەتێکی زۆر سەیری هەبووە.

لە بنەماڵەکەمان زەینەب خان زۆر بەو چووە، لە دوای هاتنی ئینگلیز و ڕاکردنی مەلا ڕەئووف (مسس بێڵ بە دوای سۆراغی مەلا ڕەئووف داگەڕاوە، ئەویش خۆی شاردۆتەوە، کە مەلا ڕەئووفی بۆ نەدۆزراوەتەوە داوای کردووە زەینەب خانی کچی مەلا ڕەئووفم بۆ بێنن دیارە بێڵ زانیاری تەواوی وەرگرتووە لەسەر بنەماڵەی خادم سوجادە زەینەب خانیان بەرەوە بەغدا بردووە بۆ لای مسس بێل ئەم خانمە داوای لە زەینەب خان کردبوو گووتبووی باوکت کەسایەتییەکی سیاسی و شارەزا و ئینگلیزی زان و دەرچووی حقوقە دەزانیین جاران عوسمانی پەروەر بووە و کوردێکی ڕەگەز پەرستە بۆ خۆی شاردۆتەوە با بێتە لامان یان ئێمە سەردانی دەکەین با دۆستایەتیمان بکات هەموو یارمەتییەکی دەدەین تەنها لەگەڵمان بێت و خەڵکمان لێ هان نەدات، ئێستا لە زۆربەی شار وشارۆچکەکان و دێهاتەکان بێ ئەوەی ئێمە پێیان بڵێین و ئاگاداریان بکەینەوە پیاو ماقولان خۆیان دێن بەیعەت بە بەریتانیای عوزما دەدەن.

(زەینەب خان)یش لە وڵامدا گووتبووی پەیامی باوکم ئەوەیە بۆ ئێوە (ڕقی لە چارەی تۆ و بەریتانیای عوزما دەبێتەوە) مسس بێڵ بە پێکەنینەیەکی پڕ قین گووتبووی بۆ؟ (زەینەب خان)یش گووتبوویی لەبەر ئەوەی باوکم ئێوەی پێ زاڵم و داگیرکەرە، مسس بێڵ تووڕە دەبێت و پێ دەڵێت جوان گوێ بگرە و باوکت بڵێ (من لێرەوە پێ لە عەرز بدەم کوردستان دەلەرزێنم) زەینب خان بە زەردەخەنەیەکەوە گووتبووی (تۆ مەلا ڕەئووفێکت پێ ناگیرێ

منت هێناوە ئیهانەم بکەی ئەمرۆ بێ یان هەر ڕۆژێکی تر لاوانی کوردستان گۆڕی تۆ دەلەرزێنن)

مسس بێڵ لە دوای کەمێك بێ دەنگی چاوەکانی دەبڕێتە ناو چاوەکانی زەینەب خان و زەینەب خانیش بە بێ چاو تروکاندن سەیری چاوەکانی مسس بێڵ دەکاتەوە، مسس بێل بە زەینەب خان دەڵێت عەبدوڵڵای خورشیدە فەندی چی تۆیە؟ ئەویش دەڵێ خاڵمە برای دایکمە.

گووتبووی ئێستا لە کوێیە؟ زەینەب خان گووتبووی لای ئێوە حەبسە. گووتبووی ئەگەر مەلا ڕەئووفی باوکت بێتە لامان تەسلیمی ئەوی دەکەینەوە، زەینەب خانیش گووتبووی ئەوە مەلا ڕەئووف نەهات و ناشیەت تەنیا ئەگەر دەستگیری بکەن وەك خاڵم دەتوانن بیبینن. ئەوە بوو عەبدوڵڵای خورشیدە فەندی خاڵی زەینەب خان لە سێدارە درا.

باپیرەم مەلا ڕەئووفەفەندی عیلاقاتی بەهێزی هەبووە لەگەڵ گەورە پیاوانی وەکو (میرئەمین عالی بدرخان و کوڕەکان و برایەکانی، شێخ سەعیدی پیران، شێخ سەعیدی نەورەسی، شەهید شێخ عەبدولسەلام بارزانی، شێخ مەحموودی حەفیدزادەی بەرزنجی، پێشەوای قازی محەمەد، شێخ ئەحمەدی خودانی بارزان، مەلا مستەفای بارزان، شەریف پاشا، مستەفا پاشای یامولکی) ئەوانە وەکو پەیوەندی کۆمەڵایەتی و سیاسی جگە لە شاعیران و ئەدیبانی کورد و عەرەب و فارس و تورك.

ئەگەر بمانەوێ باسی بنەماڵەی خادم سوجادە بکەین ناتوانین لەیەك روو باسیان بکەین دەتوانم بڵێم خزمەتێکی گەورەی کورد و کوردستانیان کردووە، دووبارە سوپاسی کاك رەهبەری سەید برایمی بەرزنجی دەکەین بەردێکی بناغەی دانا وەك دەروازەیەك بۆ پرۆژەیەکی گەورە بۆ ئەندامانی بنەماڵەی خادم سوجادە کە ڕۆشنبیران بەداوداچوونی بۆ بکەن، چی دیکە کەسایەتییەکانی ئەم بنەماڵەی وەکو گەوهەر لە ژێر دەریا دا نەمێننەوە.

# پەیڤێك بۆ ماڵباتی خادم سوجادە

## سینەم خان جەلادەت بەدرخان

گەلەك دڵخۆش بووم کە بەشدار بووم لە یادەوەریی شاعیر و عەللامە و فەیلەسوف و سیاسەتمەداری گەورەی کورد مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە، لەگەڵ بەڕێزان شاعیر و ڕووناکبیر و نووسەری ناوداری شاری کۆیە (شێخ ڕەهبەر سەید ئیبراهیم بەرزنجی و دکتۆر کەمال غەمبار)[١]. بەشداری کردنم

[١] دکتۆر کەمال غەمبار نووری تەواوی (کەمال حاجی حسێن)ە، لە ساڵی ١٩٣٧ لە شاری کۆیە لەدایك بووە، لە ساڵی ١٩٦٢ لە کۆلێژی پەروەردەی سەر بە زانکۆی بەغدا بەشی زمانی عەرەبی و ئەدەبیاتی عەرەبی تەواوکردووە.
ماجستێر و دکتۆرای لە زمانی عەرەبی هێناوە
بەشداری کردووە لە نوسین و وەرگێڕانی دەیان کتێب لەوانە:
قراءتي للصف الرابع الابتدائي
قراءتي للصف الخامس الابتدائي
قراءتي للصف السادس الابتدائي
الموضوعات الاجتماعية للصف الرابع الابتدائي/ترجمة
ئەدەبی منالان بۆ پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایان
هەروەها بەشداری کردووە لە وەگێڕانی ئەم بەرهەمانە لە زمانی عەربییەوە بۆ کوردی:
مبادئ الجغرافية للصف الاول المتوسط
الجغرافية العامة للصف الرابع الإعدادي
تأريخ رياض الأبطال
خاوەنی سەدان بەرهەمە، ئەندامی دامەزرێنەری یەکێتی نوسەرانی کوردە لە ساڵی ١٩٧٠
ئەندامی دامەزرێنەری ڕێکخراوی مافی مرۆڤی کوردستان ساڵی ١٩٩١
ئەندامی دامەزرێنەری سەندیکای ڕۆژنامەنووسانە لە ساڵی ٢٠٠٤
ئەندامی سەندیکای هونەرمەندانی کوردستانە و هەروەها ئەندامی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی عێراق و یەکێتی ڕۆژنامەنووسانی جیهانە.
سکرتێری ئەنجوومەنی ئاشتی و یەکرگتن- لقیی هەولێر
لە ساڵی ١٩٧٠ بە سەرۆکی سەندیکای مامۆستایان هەڵبژێردرا.
لە ساڵی ١٩٩٤ بە سەرۆکی لقی هەولێری یەکێتی نوسەرانی کورد هەڵبژێردرا
چاودێری زمانەوانی ڕۆژنامەی فەرمی وەزارەتی دادی عێراق (الوقائع العراقية) لە ساڵی ١٩٨١ تاکو ١٩٨٧/١١/١٢
لە ساڵی ٢٠٠٤ بە بەڕێوەبەری کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆ دامەزرا لەلایەنی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە تاکو کۆتایی هاتنی ڕێککارەنی گشتپرسی دەستووری ٢٠٠٥
لەسەردەمی مەلکەیەتدا ٣ جار دەستگیرکراوە لە ساڵی ١٩٥٣ و ١٩٥٤ لە کۆیە و ١٩٥٦ لە بەغداد، وە دووجار براوەتە دادگای عورفی.

و قسەكردنم لەسەر ئەم خانەوادەیە بۆ من شەرەفێكی گەورە بوو لەبەر كورتی ماوەكە، بەخێرایی بەسەر پەیوەندیی مێژوویی هەردوو بنەماڵەی خۆم بەدرخانییەكان و بنەماڵەی خادم سوجادەدا تێپەڕدەبم، ئەم بەشداریكردنەم لەبەر باری تەندروستیم بە ڤیدیۆ تۆمار كرد و بۆم ناردن.

سەرەتا دەمەوێت دەستخۆشی لە شاعیر و نووسەری شاری كۆیە (شێخ ڕەهبەر سەید ئیبراهیم بەرزنجی) بكەم بۆ نووسینی ئەم بەرهەمە لەسەر خانەدان و زانای گەورەی كورد مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە. من لە ڕێگای دیرۆكی ماڵباتی خۆمان ماڵباتی بەدرخانییەكان و بەتایبەتی باپیرەم میر ئەمین عالی بەدرخان و باوكم میر جەلادەت بەدرخان و د. كامەران بەدرخان و مامەكانی دیم و دایكم ڕەوشەن بەدرخان، زانیاریم لەسەر بنەماڵەی خادم سوجادە پەیدا كردووە. هەر لە سەردەمی موفتی و زانای گەورە مەلا مەحمووده فەندی خادم سوجادە، كە دەكاتە باوكی مەلا ڕەئووف، ئەم پەیوەندییە لەگەڵ بنەماڵەی ئێمە دروست بووە. بۆ خۆم لەسەر زاری دایكم و مامم كامەران بەدرخان گوێبیست بووم، مەلا مەحمووده فەندی خادم سوجادە لەگەڵ حاجی قادری كۆیی خاڵۆزا و پورزای یەكتر بوونە و سەرەتا لە موسڵ دەستیان كردووە بە دەرسگوتنەوە و دواتر ڕوویان لە ئەستەنبوڵ كردووە و پەیوەندییان لەگەڵ ماڵباتی میرانی بەدرخانییەكان پەیدا كردووە و دەرسی كوردی و فارسییان بە منداڵەكانیان گوتۆتەوە.

لە دوای زانای گەورە مەلا مەحمووده فەندی ئەم پەیوەندییە بەردەوام بووە لە نێوان باپیرەم میر ئەمین عالی بەدرخان و مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە، كە ئەو كاتە مەلا ڕەئووف لە هەرەتی گەنجیدا بۆ خوێندن چۆتە

---

لەسەردەمی كۆمارییەتدا سێ جار دەستگیركراوە، لە ساڵانی ١٩٥٩ تاكو ١٩٦٠-١٩٦١ براوەتە دادگا لای عقید شمس الدين عبدالله

دوای تەواوكردنی خوێندن بۆ ماوەی دوو مانگ دامەزراندنەكەی دوا دەكەوێت، پاشان وەك مامۆستا دادەمەزرێت. بەپێی بڕیارێكی ئەنجومەنی سەركردایەتی شۆڕش(هەڵوەشاوە) بە ژمارە ٩٥٣ لە ١٩٧٨ ڕاژەكەی لە وەزارەتی پەروەردە دەگوازرێتەوە بۆ وەزارەتی داد. بەهۆی ڕەزامەندنەبووی دەگوازرێتەوە بۆ دادگای شەرعی لە بەسرە بە سیفەتی (معاون قضائي) وەكو سزایەكی پلە داگرتنی وەزیفی، چونكە معاون قضائي پێویستی بە دەرچووی پەیمانگایە نەك كۆلێژ.

لە هەشتەمین ئینقلابی سیاسی لە ساڵی ١٩٦٣ خۆی دەربازكرد و توانی پەیوەندی بە ڕیزەكانی پێشمەرگەوە بكات.

لە ٢٠٠٦/١/١ بە پلەی ڕاوێژكاری پەروەردەیی لە ئەنجوومەنی وەزیرانی هەرێمی كوردستان خانەنشین دەبێت.

ئەستەنبوڵ و لەوێ هەم حقوقی تەواوکردووە و هەم لەگەڵ باپیرەم ئەمین عالی بەدرخان و خەڵکی دیکە لە ساڵی ١٩٠٠ تا ١٩٠٨ (جەمعیەتی تەعالی کوردستان)یان دامەزراند.بەپێی زانیارییەکانی مامم میر د. کامەران بەدرخان و ڕەوشەن خان بەدرخانی دایکم، مەلا ڕەئووف لەگەڵ شەریف پاشا چۆتە فەڕەنسا و دواتر گەڕاوەتەوە ئەستەنبوڵ و لەوێ گیراوە و دواتر چۆتە یەریڤان و لەوێوە چۆتە مۆسکۆ و لەم بەند و حەپس و گەشت و گەڕانەدا بۆ ماوەی چەند ساڵێك لە شاری شیرازی ئێران ژیاوە و دایکم دەیگووت خەریکی زانیاری کۆکردنەوە بووە لەسەر کورد لەو وڵاتانەدا.

جگە لە بنەماڵەی ئێمە بەدرخانییەکان، هاوڕێیەتی زۆر نزیکی لەگەڵ شەهید شێخ عەبدولسەلامی بارزانیدا هەبووە و ئەم پەیوەندییەش وەك مامم د.کامەران بەدرخان دەیگووت دەگەڕێتەوە بۆ شێخ عەبدولسەلامی گەورە لە کۆیە لە مزگەوتی خادم سوجادەی خوێندووە و لەلای زانایانی خادم سوجادە. هەر لەوێش لەسەر دەستی مەولانا خالیدی نەقشبەندی ئیجازەی تەریقەتی وەرگرتووە، مەولانا خالید بەر لەوەی بچێتە هیندستان علومی دینی لە مزگەوتی خادم سوجادە خوێندووە لەلای عەللامە مەلا سەعدی خادم سوجادە کە باپیرەیان لەگەڵ یەك ئامۆزا بووە.

شێخ عەبدولسەلامی گەورە ماوەیەکی زۆر لە مزگەوتی خادم سوجادە علوم شەرعییەکانی لەوێ خوێندووە و هەر لەوێش تەریقەت و پایەی شێخایەتیی نەقشبەندی لەسەر دەستی مەولانا خالیدی نەقشبەندی وەرگرتووە و کە گەڕاوەتەوە دەڤەری بارزان و ئیرشادی شێخایەتیی کردووە و تەریقەتی نەقشبەندی بە دەڤەرەکەدا بڵاوکردۆتەوە. ئەم پەیوەندییەی نێوان شێخ عەبدولسەلامی گەورە و بنەماڵەی خادم سوجادە گەیشتۆتە نێوان شێخ عەبدولسەلامی شەهید و مەلا ڕەئووفی کوڕی عەللامە مەحمووده فەندی کوڕی عەللامە سەعدی خادم سوجادە. ئەوانە زیاتر هەوڵیان داوە بۆ پرۆژەیەکی نەتەوەیی و دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی و سەربەخۆیی کوردستان.

مەلا ڕەئووفی خادم سوجادە جگە لەوەی شاعیرێکی گەورە بووە و سیاسەتمەدار و قانوونناس و زمانزانێکی گەورە بووە و پەیوەندیی لەگەڵ

زۆربـەی کەسـایەتییە بەناوبانگەکانی کـورد هەبـووە جگـە لـەوەش شـاعیر و سیاسـەتمەدارانی عـەرەب و فـارس و تورکـی سـەردەمی خـۆی هەبـووە. یەکێـك لـەو کەسـایەتییە تورکانـە نـاوی (صفـوت بـەگ) بـووە. ئـەم (صفـوت بـەگ)ە هاوڕێیەکـی نزیکـی شـەهید شـێخ عەبدولسـەلامی بارزانیش بووە. لە سـاڵی ١٩٠٧ بـە ئامادەبوونـی مـەلا ڕەئووفـی خـادم سـوجادە و (صفـوت بـەگ) بـەردی بناغـەی یەکـەم قوتابخانـە لـە بـارزان دانـدراوە. (صفـوت بـەگ) پڕۆژەیەکـی بەدەسـتەوە دەبێـت لـە ئەسـتەنبوڵ، سـەرکەوتوو نابێـت و دێتـە بـارزان خـۆی حەشـار دەدات و ماوەیـەك لـەوێ دەمێنێتـەوە و دواتـر شـەهید شـێخ عەبدولسـەلام بارزانـی لەبـەر دووره دەسـتی و ئەمینـی دەینێرێتـە لای مـەلا ڕەئووفـی خـادم سـوجادە لـە کۆیـە و (٣ تـا ٤) مانـگ بەبێ ئـەوەی بیەڵـن کـەس بزانێـت لـە ماڵـی مـەلا ڕەئووفەفەنـدی خـۆی حەشـار دەدات و دواتـر دەیەوێـت بگەڕێتـەوە بـۆ وڵاتـی خـۆی هەرچەنـدە مـەلا ڕەئـووف پێـی دەڵێـت ئـەو دەیـەوێ بگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو پڕۆژەیـەی هەیبـووە و بەڵێـن بـە مـەلا ڕەئـووف دەدات و دەڵـێ ئەگـەر سـەرکەوتم ئـەوە کـوردەکان ژیانیـان دەگۆڕێـت. ئەوەبـوو گەڕایـەوە و پڕۆژەکـەی سـەرنەکەوت.

لـە کاتـی دەسـتگیرکردنی شـەهید شـێخ عەبدولسـەلام بارزانـی دا لـە سـاڵی ١٩١٤ لەلایـەن بەکرێگیراوانی عوسـمانی لـە سـاڵی ١٩١٤ کـە هەڵوێسـتی مـەلا ڕەئووفەفەنـدی خـادم سـوجادە نابـێ لەبیـر بکرێـت. لـە دوای دەسـتگیرکردنی شێخ عەبدولسـەلامی شـەهید، یاداشـتێك دەنووسێت و دەچێتە لای سلێمان نەزیف والـی موسـڵ و داوای ئازادکردنـی شـێخ عەبدولسـەلام دەکات و والـی سـلێمان نەزیـف خـۆی لـێ تـووڕە دەکات و وەکـو سەرزەنشـت کـردن دوو ڕۆژی دەخاتـە بەندیخانـە و دواتـر ئـازادی دەکات و ئـەو کاتـە مـەلا ڕەئووفەفەنـدی مـاوەی (١٠) ڕۆژ بـووە لـە بەڕێوەبـەری نفوسـی کۆیـەوە کراوەتـە قـازی لـە بەغـدا. دیـارە والـی سلێمان نەزیف ڕاپۆرتـی لەسـەر بەرزکردۆتـەوە و یەکسـەر لـە کاری قازییەتییان دوورخسـتۆتەوە و لـە کۆیـە هێناویانەتـەوە شـوێنی خـۆی و کراوەتـە فەرمانبـەر و لـە هەمـان کاتیشـدا پلـەی فەرمانبەریشـیان لێسـتاندۆتەوە و لـە ئەسـتەنبوڵیش وەکـو کەسـێکی پیـاو خـراپ و چەتـە ناوزەندکـراوە، لـە دوای لـە سـێدارەدانی شـەهید شـێخ عەبدولسـەلام بارزانـی، ناودارانـی کوردسـتان بەگـری لێدەکـەن و

خۆشی چەند کەسایەتییەکی باڵا دەستی هاوڕێی بووە لە ئەستەنبوڵ فشار دەخەنە سەر (والی سلێمان نەزیف) ئەوەیش لە ساڵی ١٩١٦ بە دوایدا دەنێرێت و جاری یەکەم مەلا ڕەئووفەفەندی ناڕوات بۆ لای والی سلێمان نەزیف بۆ جاری دووەم، کەسایەتییەکی گەورەی کۆیە ڕادەسپێرن و مەجبور دەبێت بڕوات، کاتێ مەلا ڕەئووف بە دڵشکاوی دەچێتە لای والی (سلێمان نەزیف) والی لە دەرگا پێشوازییان لێ دەکات و کاتێ دەڕۆنە ژوورەوە کۆمەڵێك کەسایەتی و پیاوانی ئاینی لەوێ دەبن. (سلێمان نەزیف) بە زەردەخەنەوە دەڵێت (شێخ عەبدولسەلام)یش گەیشتە جێی حەق.

(مەلا ڕەئووف)یش لەجیاتی وەڵامی بداتەوە و چاونەترسانە هەڵدەستێتە سەر پێ و هەردوو دەستی بەرز دەکاتەوە و دەڵێ (ئەلفاتیحە) ئەوەی لەو مەجلیسە بووە هەموویان بێ ئیرادەی خۆیان دەست دەکەن بە فاتیحە خوێندن، دەگێڕنەوە هەبووە نەیزانیوە بۆچی (فاتیحە)کە دەخوێنێ. هەندێکیش وەکو ئەفسانە لە هەولێر و کۆیە و ڕەواندز و کوردستان گوتوویانە ئەوەە کەرامەتی شێخایەتیی شێخ عەبدولسەلام بووە. لە دوای دوو ساڵ لە دیوانی سلێمان نەزیفی والی موسڵ دەری خستووە. هەر لەوێ سلێمان نەزیف بە مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە دەڵێ: (دەزانی بۆ چیم بانگ کردووی؟!، مەلا ڕەئووفیش دەڵێی نەخێر سلێمان نەزیف دەڵێت: تۆ کەسێکی لە ئەستەنبوڵ دەتناسن و حقوقت تەواوکردووە و لە بابولعالی فەرمان کراوە بتکەین بە ئەندامی ئەنجومەنی ویلایەتی موسڵ. مەلا ڕەئووفیش زۆر مەردانە داواکەی والی موسڵ ڕەت دەکاتەوە و چەندی والی موسڵ داوا دەکات ئەویش دەڵێ: من ئەم وەزیفەم ناوێت).

سلێمان نەزیف پێی دەڵێت: دیارە قسەمان دەشکێنیت؟! مەلا ڕەئووفیش پێ دەڵێت: بەڵێ وەکو ئەوەی ئێوە قسەی منتان شکاند. ئەمە یەکێك لە هەڵوێستە جوان و مێژووییەکانی مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە بوو.

مەلا ڕەئووفەندی خادم سوجادە لەگەڵ هەندێ لە منداڵەکانی زەینەب خان و سەعدی و سەعید ئاغای زاوای دەڕۆنە لوبنان لە ساڵی ١٩٢٦ بەشداریی دەکەن لە دامەزراندنی خۆیبوون لە بەیروت لەگەڵ میر جەلادەت بەدرخانی باوکم

و چەندان کەسایەتیی دیکە دواتر لەوێوە دەڕۆنە شام. هەموو مەبەستەکان لەسەر چارەسەری و سەربەخۆیی کوردستان بووە و منداڵەکانیشی لەسەر کوردایەتی و نیشتمانپەروەری پەروەردە کردووە و هەتا پلە و شەهادەی بەرزی خوێندنیان هێناوەتەوە. مەلا ڕەئووف خۆی حقوقی لە ئەستەنبوڵ تەواوکردووە و زەینەبی کچی لە بەغدا خوێندوویەتی و سەعدی و ئاسەفیش حقوقیان تەواوکردووە و هەموو منداڵەکانی خوێندنیان تەواوکردووە و هیچیان لەو سەردەمە نەخوێندەوار نەبوونە و هیچ بنەماڵەیەکیش لە کوردستان ئەوەندە دەرچووەی حقوقیان نەبووە.

ئەم بنەماڵەیە هەموو ژیانی خۆیان تەرخان کردووە بۆ زانست و ئایین و کوردایەتی و نیشتمانپەروەری. هاوسەری مەلا ڕەئووف زەهوە خانی کچی خورشیدە فەندی، کە دایکم لە هەولێر و کۆیە سەردانی دەکرد، پێیان دەگووت مەلا زەهوە ژنێکی زۆر لەسەرخۆ و ئیماندار و دەست بە تەسبیح و دەم بە زیکر بوو، قورئانخوێن و شارەزا لە علومی شەرعی و ئەدەبیاتی عەرەبی و فارسی و کوردی بووە.

خورشیدە فەندیی باوکی مەلا زەهوە ئامۆزای حاجی قادر بوو، لە سەردەمی عوسمانییەکان ماوەیەك قایمقام بووە، دواتر حاکمی کۆیە بوو. یەکەم قوتابخانە لە کۆیە لەسەر دەستی خورشیدە فەندی کرایەوە و خانووەکەی خۆی بەخشیە قوتابخانە. زەهوە خان یاخود مەلا زەهوە حوجرەی تایبەتی خۆی هەبوو بۆ دەرس گوتنەوە بە منداڵان و ژنانی کۆیە و ژنانی فێرە خوێندەواری دەکرد. یەکەم حوجرەی ژنان لەسەر دەستی زەهوەخان لە کۆیە کرایەوە و بۆ ژنان کە فێری خوێندەوارییان بکات و علومی شەرعییان فێر بکات.

ڕەوشەن بەدرخانی دایکم لە ساڵی لە هەولێر سەردانی دەستە خوشکی خۆی زەینەب خان کچە کورد کردەوە و دواتر لەگەڵ زەینەب خان ڕۆیشتۆتە کۆیە بۆ خزمەت زەهوە خانی خورشیدە فەندی و لەوێ دایکم و زەینەب خان چاویان بە ژنانی کۆیە کەوتووە و سەردانی چەند ماڵێکی خانەدانی کۆیەیان کردووە، هەروەها لەگەڵ زەینەب خان چوونەتە سلێمانی بۆ سەردانی مونیرە قەفتان ئەوە لە ساڵی ١٩٥٣ بوو، جگە لەوە زۆر جاری تریش دایکم سەردانی

زەینەب خانی کردووە لە هەولێر و زەینەب خانیش لەگەڵ فازیل و ڕەمزی کوڕی لە شام سەردانی دایکمیان کردووە.

پەیوەندییەکی زۆر بەتین و گەرم و گوڕ لە نێوان مەلا ڕەئووف و مامەکانیشم دا هەبووە، وەك زانیاریم هەیە لە ساڵی ١٩٣٥ مەلا ڕەئووف و زەینەب خانی کچی و سەعدی کوڕی سەردانی مامم سورەیا بەدرخانیان کردووە لە قاهیرە و لەم سەردانەدا بەڕێز قەدری جەمیل پاشاش ئامادە بووە، مەبەستی ئەم سەردانەش تەنیا بابەتێکی کۆمەڵایەتی نەبووە، بەڵکو هەوڵ و تەقەلّلای ئەوانە بووە تا بتوانن لە ڕێگای پەیوەندییە دیبلۆماسی و سیاسییەکان هەوڵی مافی کورد و دەوڵەتی کوردی بدەن، بەڵام وەك مامم (د. کامەران بەدرخان) دەیگێڕایەوە، کە مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە، دوژمنێکی سەرسەختی ئینگلیز بووە و قەت بڕوای بە ئینگلیز نەبووە، بەڵام لە هەوڵ و تێکۆشانی سیاسی نەوەستاوە بۆ مافی کورد و کوردستان. لەلایەکی دیکەوە مەلا ڕەئووف خادم سوجادە، مامم عەبدولڕەزاق بەدرخانی زۆر خۆشویستووە و ماوەیەك عەبدولڕەزاق بەدرخان لە کۆیە لە ماڵی ئەوان بووە و دواتر مەلا ڕەئووف ماوەیەك لەگەڵ چۆتە ئێران و لەوێ سەردانی چەندان شار و دێهاتی کوردنشینیان کردووە، وەکو (ورمێ و سابڵاغ و سنە و مەریوان و دواتر شنۆیەیان).

لە سەرێکی دیکەوە مەلا ڕەئووفەفەندی زوو سەردانی سابڵاغ کردووە و هاوڕێیەکی هەرە نزیکی پێشەوا قازای محەمەد بووە و هەتا منداڵەکانیشی پەیوەندی و هاموشۆیان لەگەڵ پێشەوا قازیدا هەبووە، لەوانە (زەینەب خان و سەعدی و ئاسەف و دواتر دڵدار) لە ڕووی ماددیشەوە هاوکاریی پێشەوایان کردووە. لەگەڵ شێخ مەحموودی حەفیدیش بە هەمان شێوە پاڵپشتی شێخان کردووە و لەگەڵیدا یەك دەنگ بوونە.

دایکم دەیگێڕایەوە کە میر جەلادەت خانی باوکم لە برایەکی خۆی زیاتر لە مەلا ڕەئووف نزیك بووە و مێژووی گەورەی ئەم بنەماڵەیەکی بۆ دایکم باس کردووە و دایکیشم زۆر نزیك بوو لە زەینەب خان و وەکو خوشکی گەورەی خۆی سەیری کردووە و کاتێ زەینەب خان لە ساڵی ١٩٦٣ وەفاتی کرد دایکم و مامم د. کامەران بەدرخان سەردانی هەولێریان کردووە،

هاتنە پرسەی ئەم خانمە گەورەیەی کورد، بەردەوام لەگەڵ ڕەوشەن بەدرخانی دایکم کتێبی و دیارییان بۆ یەکتر ناردووە و دایکم زۆر بە زەینەب خانم سەرسام بوو، دەیگووت زمانزان و شاعیر و هزرڤانێکی مەزن بوو، نەك تەنیا کورد، بەڵکو ڕۆژهەڵاتی ناوین ژنێکی مەزنی لە دەست دا.

زەینەب خان هەرگیز بە تەنگ شۆرەت و خۆدەرخستن نەبووە، ئەوەندەی ویستویەتی لە مەجالیسەکان بۆچوون و هزری بگات. کە ئامانجی نیشتمان و نەتەوەی کورد بووە. زەهوە خانی دایکیشی ژنێکی سەرسووڕهێنەر بووە لە خوێندەواری و زیرەکی.

وەك لە دایکم بیست مەلا ڕەئووف ئەوەندەی متمانە و باوەڕی بە زەینەبی کیژی بووە بە هیچ کەسێکی نەبووە. دیارە مەلا ڕەئووف زانایەکی گەورە بووە و پێشبینییەکانی دروست دەرچوونە و زەینەب خان سەرپەرشتیی هەموو براکانی کردووە و بەتایبەت هەم دڵداری بەخێوکردووە و هەم پەروەردەشی کردووە. ئەمڕۆشی لەگەڵ دابێ هیچ باوکێك ئەگەر کچکەی بەشوو بدات و دواتر کوڕێکی بچووکی خۆی قبوڵ ناکات و بیداتێ. دیارە هەموو متمانەیەکی بە زەینەب خان بووە، بۆیە دڵداری داوەتێ وەکو کوڕی زەینەب خان و سەعید ئاغای زاوای بووە. تا ئێستا هیچ باوکێك ئەمەی نەکردووە، دیارە بڕوای بەوە هەبوو، کە ژن هێز و توانای هەموو شتی هەیە و دواتر ئەو کچەی زۆر لەکن گەورە بووە. پێشبینییەکانی مەلا ڕەئووف ڕاست دەرچوون لە دوای مردنی مەلا ڕەئووف و جوانەمەرگ بوونی براکانی بەسەریەکەوە، زەینەب خان سەرجەم منداڵە برازاکانی گرتنە خۆی و بەخێوی کردن و لەگەڵ سەعید ئاغای بەشویان دان.

هەروەها زەهوە خانی خێزانی مەلا ڕەئووف تا وەفاتی کرد لەلای زەینەب خانی کچی دەژیا لەماڵی سەعید ئاغا. من خۆم کوڕەکانی زەینەب خانم دیتبوو (فازل و ڕەمزی) لە موفاوەزاتی ساڵی ١٩٧٠ ئیتفاقی (١١ی ئازار) بوو. لەگەڵ مامم د. کامەران بەدرخان شاری هەولێر لە گەڕەکی ئازادی سەردانی ماڵی کاك ڕەمزی سەعید ئاغامان کرد. پەیوەندیمان هەر بەردەوام بوو لەگەڵ ئەم خانەوادەیە.

دەتوانم بڵێم مەلا ڕەئووف خادم سوجادە زانایەکی هەرە گەورەی کورد بوو، پیاوێکی مەوسوعی بوو. بۆیە زۆر دڵخۆشم کە بەڕێز کاك شێخ ڕەهبەر سەید ئیبراهیم بەرزنجی بە نووسینی ئەم کتێبە پەنجەرەیەکی ڕووناکی لەسەر مێژووی زانایەکی گەورەی کورد مەلا ڕەئووفەفەندی کردۆتەوە و دەستخۆشی لە بەڕێزیان دەکەم و سەرەتایە بۆ شتی گەورەتر لەسەر مێژووی گومناوی بنەماڵەی خادم سوجادە.

* * *

سینەم جەلادەت بەدرخان، لە بنەماڵەیەکی نیشتمانپەروەر لە ساڵی ١٩٣٨ لە دیمەشق لە دایکبووە و قوتابخانەی ڕاهیباتی فەڕەنسی لە شام تەواوکردووە، بەکالۆریۆسی زمانی فەڕەنسی و عەرەبی وەرگرتووە، بۆ ماوەی دوو ساڵ خوێندنی بۆ پارێزەری خوێندووە، ساڵی ١٩٦٠ بەهۆی هاوسەرگیریکردنی لەگەڵ ئەندازیار سەلاحەدین محەمەد سەعدوڵلا هاتووەتە باشووری کوردستان، ماوەیەکی زۆر لە کەرکوك و بەغدا نیشتەجێ دەبن، لە دوای ڕێککەوتنامەی ١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ دەبێتە سەرۆکی لقی کەرکوکی یەکێتی ئافرەتانی کوردستان، ساڵی ١٩٧٤ بە بڕیاری حزبی بەعس لە کەرکوك دەرکراون، ساڵی ١٩٨٠ بووەتە مامۆستا لە قوتابخانەیەکی نەتەوەیەکگرتووەکانی تایبەت بە زمانی فەڕەنسی، لە ساڵی ١٩٩٥ خانەنشین بووە و خاوەنی کوڕ و کچێکە بەناوەکانی (دڵناز و ئازاد)ئێستا لە هەولێری پایتەختی کوردستان دەژی[1].

١ساسان دەروێش: سینەم بەدرخان: ئەو ئاڵایەی تەمەنی ١٠٤ ساڵ بوو ڕادەستی سەرۆك بارزانیم کرد، ڕۆژنامەی خەبات، ژمارە (٦٥٠٤) ٢٠٢٣/٤/٢٦

## لەبەر چی خادم سوجادە؟:

شاری کۆیە، بە پیت و شۆیە، لە شتڵی باش و بنەتۆی چاك بەرەکەتە، زەینەب خان-کچە کورد کۆیەی پێ شاری مەعریفەتە، خانەوادەی خانەدانی خادم سوجادە، لە هۆزی جافن لە تیرەی پیرمیکایلی و ڕەسەنزادە، بە گوێرەی بنەماڵەی زانیاران، لەسەر گوزەشتەی دیار و ناوداران، کەوا باپیرانی پیرمیکائیلی عوسمانی لە ساڵی ٥١٧ کۆچییەوە کەوتوونەتە دەودانی جوانڕۆیە، لەوێوە بڵابوونەتەوە بە شارەزوور و قەرەداغ و سەنگاو لە ساڵی ١١٦٠ کۆچی هاتوونەتە شاری کۆیە، خادم سوجادە نازناوی شەڕەفە، مێژووی مەزن و جوانییان هەرگیز ناکرێ خەفە، ئەو ناوە پیرۆز و زەریفە، هەروەك خادمین حەرەمێن شەریفە، عەللامەی گەورە (مەلا سەعدی خادم سوجادە) بە قەد قامەتی خۆی کتێبی داناوە، لە ئاستی وەستاوە بەو رادە، مودەڕڕیس و زانای بەرز و خاوەن دانراوی بەنرخ، هاوتای دەگمەن بووە لەو زەمان و چەرخ و کەرخ ساڵی ١٨١٠ عەبدولڕەحمان پاشای میری بابان، مزگەوتی (منارە) ی لە کۆیە بۆ مەلا سەعدی خادم سوجادە دروستکردووە[1] چونکە زانایەکی گەورە و دیار و درەوشاوەبوون وەك ئەستێرەی تابان، ئەو بنەماڵەیە ناسراوە، بەڕماڵی پێغەمبەریان پێ بەخشراوە، لە گونبەدی دەوران، لە کەشکەڵانی کەیوان، بەڕماڵی پێغەمبەر ڕەنگی خاکی و کاڵ دروست کرابوو لە تووکی حوشتر، بنەماڵەیەکی مەزن بووین دیارە نەبوو لەوان دیارتر و باشتر، بەڕماڵی پێغەمبەریان لە بۆنە ئاینییەکان بەرێ و ڕەسم دەیانهێنا دەر، دەبوو بە زیکر و نزا و سەڵاوات بەرماڵەیەکی دیکەیان دەخستە سەر، ئەوجا نوێژیان لەسەر دەکرد چەندان جار، بۆنی بەڕماڵیان دەکرد وەك گوڵی باخی نەو بەهار، لە پیرۆزی حەزرەتی پێغەمبەری، کە دەست و سەری موبارەکی خستۆتە سەری.

---

[1] پ.ی.د. ئاراس محمد صالح: بزاڤی خوێندن و زانستیی شاری کۆیە لە سەدەی نۆزەدا، (کۆنفراسی نێودەوڵەتی کۆیە لە ڕەوتی شارستانییەتدا، چوارەمین کۆنفرانسی نێودەوڵەتی ناودارانی کۆیە، بڵاوکراوەی زانکۆی کۆیە،٢٠١٩) ل١٤٧

# مەلا سەعدی خادم سوجادە و نالی:

مەلا سەعدی خادم سوجادە بن ئامۆزای حەزرەتی نالی بووە[1] لە هەمان کاتدا زەینەب خانی کچی خۆی داوەتێ بۆتە زاوای و سوڵتانی خەیاڵی بووە، حەزرەتی نالی لە سێ کوچکەی بابان لوتکەی ئەدەب بووە، لە داونانەوەی شیعری کێ دەڵێ (**حەبیبە و مەحبوبە**) زەینەب نەبووە؟ چونکە بە داوە، سەد داوی ناوەتەوە، مەرجانی شیعری بە مانا و مەودایەکی دیکە لێکدراوەتەوە، نالی حەریفی کەس نیە، تەبعی شەکر باری بەس نیە، (**مەعنایی زۆر و گەورە بە لەفزی کەم و بچووک**)، نیشانە دەپێکێ کون دەکا بە نووك، بە قووەتی حیکمەت ئەدا دەکا، پارچە مسوەدەی بە ڕۆح سەودا دەکا، چونکە (**شا**) شاعیرێکە بەشانازی و خۆنازی و خۆرازیەوە و نەوازە و جیاواز:

**زاهیر و باتین لەسەر لەوحی حەقیقەت یـــا مەجاز[2]**

**ئاشنایی سیرڕەی قەڵەمر بێ غەیری (نالی) کەس نەما**

وشەی شیعرەکانی ڕەگەزدۆز و ڕەنگاوڕەنگ و ئەفسوناوی وسیحر:

**(نالی)بەداوە شەرعی دەقیقی خەیـــاڵی شعر[3]**

**بۆ ئەو کەسەی کە شاعیرە سەدی داری نایەوە**

سەرنج ورد و وردەکار کە خامەی دەگرت و هەڵی دەکر قۆڵ و باسکی:

**شیعری خــــەڵکی کەی دەگاتە شیعری من بۆ نـــاسکی[4]**

**کەی لـــە دیقەتدا پەڵك دەعـــــوا لەگەڵ هەودا دەکا**

**بێتە حوجرەمر، پارچەپارچەی موسوەدەمر بکڕێ بەرۆح**

**هەرکەسێ کوتاڵ و پارچەی بێ بەدەل سەودا دەکــــــا**

[1] حەزرەتی نالی لەسەر مەلا سەعدی خادم سوجادە شیعرێکی نایابی هەیە خۆم بە دەستنووس دیومە.

[2] عەتائوڵڵا حەواری نەسەب: دەقی دیوانی نالی، (بەپێی نوسخەکەی: مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس)، (تەهران: انتشارات کردستان، ١٣٨٥ هەتاوی)، ل٢٩

[3] هەمان سەرچاوە، ل١٤٤

[4] حەزرەتی نالی لەسەر مەلا سەعدی خادم سوجادە شیعرێکی نایابی هەیە خۆم بە دەستنووس دیومە.

# مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە:

لە بنەماڵەیەکی هەرە گەورەکانی کوردستانن خادم سوجادە[1]، بەڵام ناو و مێژوویان پەرش و بڵاو و بەربادە، تێرۆری ناو و ڕۆح و مێژوو کراون، لە دەلاقەی تەپ و تۆزاوی بێ بایەخپێدان داندراون، ڕەئووفەفەندی مەلا مەحموودی مەلا سەعدی خادم سوجادە، هەقی خۆی نەدراوەتێ لە دین و سیاسەت و ئەدەب کەمتر بەریادە، باوکی زەینەب خان و دڵدارە مەلا ڕەئووفەفەندی، ساڵی ١٨٧٠ لە کۆیە لە دایکبووە لە گەڕەکی بەفری قەندی، ڕەنگە ڕەنگی نەبێ لە ناو کوردان دەگمەنن باوك و کچ و کوڕ شاعیر بووبن، وا بە کەسایەتی و پڕتەوبەخش و کراوە و کۆمەڵایەتی و ڕەوشەنبیر بووبن، خوا ئادەمی لە قوڕ دروستکرد و فریشتەکان لە ئاگر و رووناکی، ئاخۆ دەبێ خادم سوجادەییەکان چ بێ پێکهاتەی لە خوێن و خاکی، خێزانەکەی (**زەهوە خانی خورشیدە فەندی عالیمزادە**)[2] بووە، بن ئامۆزای حەزرەتی حاجی قادری کۆیی و لەوخانەوادە بووە، بەرهەمیان (**زەینەخان-کچەکورد**)، نۆبەرە (**عەونی، سەعدی، ئاسەف، حەمید، جەواد، یونس** (**دڵدار**)، **مەجید، فاتمەخان، پاشەبەرە**) (**زەینەب خان-کچەکورد، ئاسەف و دڵدار**)، سەرمەشقی پەیڕەوی کوردایەتی و پارتایەتی بووین بە کردار، تەنانەت خاوەن شیعری قەلبی من (سامی عەوداڵ)[3]

شاعیری هەژاران و عەوداڵی جوانی ناسکخەیاڵ، چەشنی لالە گڕی گرتووە پرشنگدار[4]:

[1] خادیم سوجادە خزمەتکاری بەرماڵی پێغەمبەری ئیسلام، کە بە عەرەبی (خمیصة)یە، ئەوانەن کە تا ئێستا ئەو بەرماڵەیان لا ماوەو دەیپارێزن.

پێشڕەوی سەید برایمی: (دڵدارژیانی سیاسی)، (کۆیە، چاپخانەی سۆفیا، ٢٠٢٣)، ل٢٠

٢ د. کەمال غەمبار: (لە خادم سوجادەوە تا مارشی ئەی ڕەقیب) لە ڕۆڵی زەهوە خان)، (گۆڤاری دیوان، ژمارە (١٦)ی ئەیلولی ٢٠٢٢، هەولێر، بڵاوکراوەی ناوەندی هەولێری مەکتەبی راگەیاندنی ی.ن.ک)، ل١١

٣ د.کەمال مەعروف: سامی عەوداڵ، (سلێمانی: بڵاوکراوەی بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوکراوەی سلێمانی، چاپخانەی کارۆ، ٢٠١٠)، ل٩و١٠و١١

[4] ڕەهبەر سەید برایم: خێوەتی خارا، (سلێمانی: چاپخانەی حەمدی، چاپی یەکەم، ٢٠٢١)، ل٤٥

**زەینەب و سەعدی و ئاسەف و دڵدار[1]**

**تەعریفیان ناکرێ بە حـوکمی ئەشعار**

**ئەوانە شەئنی بەرزی کـــۆیە بـوون**

**لەمن دەفامێ شەخسی خـــوندەوار**

**حوسێنی و عاصی، ئەختەر و عـەونی**

**لە فەوقی کوللی حــــــاجی پایەدار**

**لە تونێلی تاریکی تاریخ ڕاستی و جوانییان شاردراوەتەوە، لایەنی گەشیان بە پرشنگداری ڕەنگی نەداوەتەوە، ڕەنگە ئەگەر دیوانەکەی نەبوبا، وەك مۆم بکەوتبا بەر ڕەشەبا، ساڵی ١٩٥٨ لە هەولێر قەسری باداوا ماڵی رەشاد موفتی تالآنکراو سووتا، زۆربەی بەرهەم و نووسینی مەلارەئووف لەوێ فەوتا[2]، کەم گوڵ هەیە دڕکی نەبێ، گەنمجار نیە گیا و زیوان و بڕکی نەبێ، قەرزاریانن ویژدان و مێژوو، سووتێندراون بوونەتە ڕەژوو، لە بنەماڵەیەکی بەرز و پیرۆزن، بورز و ئەلبەرز و جگەر سۆزن، دەبوو یارانی قەڵەم و سەقا، پێیان دابا قومێ لە ئاوی بەقا، لە قوتبی فەلەکن لە میعراجی جەلا، لە خانەوادەیەکی زانستی و ئاینی و مەلا، مەلا ڕەئووفەفەندی، پتەو بوو پایەی بڵندی، ژیری و شاعیری، بە زانست و ڕۆشەنبیری، لە ژیان و ئەزموون و تێگەیشتن و مەزنی بنەماڵەکەی سەری هەڵدا، ڕەگی قوولی هەبوو گەشەی بە خۆیدا و جێی خۆی کردەوە لە ناو دەروونی گەلدا، قوتابخانەی بوو ڕۆڵی هەبوو بۆ ڕۆڵەکانی، لە پەروەردە و وانە بێ گرێ و گوڵەکانی، وشە شیعرەکانی شلکە تەرز و کەژۆك و مۆریە تەرزن، ڕاز و نیاز و مراز و خوازە و ریزپەڕ و بەرزن، تەژییە لە روونبێژی و ڕەوانبێژی، غەزەلەکانی فەرشی گوڵزارە بە گوڵڕێژی، فرەزان و لێزان و بە ئەزموون، بیرگەش وەکو گوڵە حاجیلەکانی دەشتی هاموون، شیعرەکانی تەژی و سەرڕێژ لە عەشقی ئیلاهی و خوداناسی، لە ستایشی پێغەمبەر و جوانی ئافرەت و بابەتی سیاسی.**

---

١ عبدلخالق علاء الدین: (دڵدار شاعیری شۆڕشگێڕی کورد) لە موزەکەراتی یونس ڕەئووف(دڵدار)، (بەغداد: چاپ و بڵاوکراوەی دار افاق بۆ ڕاگەیاندن و بڵاوکردنەوە، ١٩٨٥) ل٩٥

٢ د.کەمال غەمبار(پێشەکی و توێژینەوە و ساغکردنەوە) و فەرهاد عەزیز خۆشناو (لێکدانەوە و شەرحی شیعرەکان)دیوانی مەلا ڕەئووف، ل٥٧

# ناسین لە جەوابی مەلەك:

لە وتەیەکی زانای مەزن ئەفلاتوونی نەمر، دەڵێ **لەگەڵ لەدایکبوونی خۆشەویستیدا مرۆڤەکان رووەدەکەنە شیعر)** (**ئەدۆنیس**)[1] باسی شیعر دەکا بە جۆرێ، رای وایە (**شیعر واقع دەگۆڕێ**) شیعر هونەرە کەرەستەکەی زمانە، جادووی جوانی و هزر و ڕامانە، لە نرخ شوناسی هۆنراوە هەستێکی ویژدانییە[2]، بە هۆی وشەکانەوە خەیاڵ دەریدەبڕێ بۆ ئەو وێنە جوان و جیهانییە، ئەدەب هەستێکی ناسکە لە جەرگەی پەڕەکانی دڵەوە هەڵئەدا، وەیا(**خورپە-الهام**)ێکە ئەکەوێتە ناوییەوە، هەستێکی کتوپڕە خاوەن خامە دەریدەبڕێ دەبتە ئەدا، مەلا ڕەئووفەفەندی شاعیر بووە بە مانای وشە، شیعرەکانی مێژوویین و واتا بەخشە، کلیلی دەرگا داخراوەکانە، دەرخەری زانیارییە نەزانراوەکانە، (**لە جوابی مەلەک**) خۆی دەناسێنێ، ڕەگ و بنەچە و ڕەچەڵەکی خۆی دەسەلمێنێ، لە ژێر ڕۆشنایی شیعرەکانی کەوا مەلا ڕەئووفەفەندی، دەبێتە خزمی حەزرەتی حاجی قادری کۆیی و حەزرەتی نالی و مەولانا خالیدی نەقشبەندی، بە ئاشکرا دەریدەخا و دەڵێ ئەوەیە ناوونیشانم و درەختی ژیانم.

**لە جوابی مەلەکدا دەڵێم، من عەبدیکی کوردی زوبانم**[3]
**هەزار هێندەم لێ ڕابخوڕن، غەیری ئەوە هیچ نازانم**
**تەوەلودم لە کۆیە بووە، کوردستانە مەفتەنی من**
**پیر میکایل جەددی منە و دەڵێن لە ئالی عوسمانم**
**عەللامە سەعدی باپیرەمە، بنعامی حاجی نالی بوو**
**هەم کیژی خۆیشی پێ دابوو،هەر ئەوەندەی لێ دەزانم**

---

[1] دانا کەمال: (شیعر و پەیوەندی لەگەڵ زەمەنی خۆیدا)، (سلێمانی، چاپخانەی کارۆ،٢٠٢٠، چاپی یەکەم)ل١٥

[2] عەلائەددین سەجادی: (نرخ شناسی)، لێکۆڵینەوە و ڕەخنەی ئەدەبی، (تەهران، بڵاوکردنەوەی کوردستان(انتشار کردستان)، ل٣٨

[3] د.کەمال غەمبار(پێشەکی و توێژینەوە و ساغکردنەوە) و فەرهاد عەزیز خۆشناو (لێکدانەوە و شەرحی شیعرەکان)دیوانی مەلا ڕەئووف، ل١٧٨

مـــەولانـــا خالد قەدەمێك، لـە نـــــالی دوورتر بوو لێمان
خزمـایەتی حـــــــاجی قـــادر، لە دایکم خاڵە و خاڵوانم
پورزای مەحموودی بـاوکمە و هەمر دوو قەندیلەی کۆییانم
ئـــامۆزای بـــــاوکی زەهوەیە، هـاوحیات نوری چـــــــاوانم
(ڕەئووف)ێکم عـەبدی خـــــودا و خزمەتچی قاپی کـۆیەمە
هەروەکـــو بـــــاوکیشم فەرمووی،کۆیە نەسەبە و عینوانم

# ئەدەبی کۆن:

ئەدەبی کلاسیکی کوردی لەسەدەی یانزدەی زایینییەوە، لەسەر دەستی (بابا تاهیری هەمەدانی)یەوە سەرهەڵدەدات[1]، یەکەمین شاعیری کلاسیکی کوردییە دوایی بە ڕێچکە و ڕێبازی جیاواز بە زاراوە لێك جوداکانی کوردیدا دەڕوات، کلاسیزمی کوردی لەسەر هیچ تیوریەکی ئەدەبی[2] میتۆدی فەلسەفی دانەمەزراوە، مەلا و میرزاکان لە حوجرەی میرنشینەکانی (ئەردەلان) و (جزیرە) و (بابان) گەشاوەتەوە[3]و پەرەی پێدراوە، وشەی نەتەوە هاوسێ و هاوئاینیەکان وەکو فارس و عەرەب و تورك بەکارهێندراوە، لە غەزەل چامەکانیاندا (تەخەلووس) و نازناویان داناوە، واتا شیعری کۆنی کوردی لە کانیلەی شیعری بابا تاهیری هەمەدانییەوە هەڵدەقووڵێ، تا تێکەڵ بەڕووباری خوڕگەی شیعری مەلا پەرێشان و مەلا جزیری و ئەحمەدی خانی و نالی و سالم و کوردی و حاجی و حەمدی دەبێ گوڵزاری ئەدەب ئاودەدا دەرەنگێ بە چەپکە گوڵێ، ئادەم یەکەمین کەس بووە کە شیعری وتووە بە بۆنەی مەرگی هابیلەوە، لەو شەلەگەوە ئەو چەشنە شیعرە ڕژاوەتە ناو جۆکە و کانیلەوە، شیعر گەردرووونێکی بێ سنوورە پەی پێی نەبردراوە، چەند پێناسە کراوە مانای تەواوی نەپێکاوە، ڕەگەزە زیندووەکانی شیعر زمان و مۆزیك و دارشتن و وێنە و خەیاڵی فرە ڕەنگە، کەرەستەکەی وشەیە باڵی هەیە دەفڕێ بەسەر گوڵاندا لە سروشتی هەنگە، خەیاڵ واتە وێنە و بیر و بیرکردنەوە ئەندێشەی شاعیر ڕەگەزی سەرەکی شیعر و پێکهێنەری وێنەی ڕەوانبێژییە، بزوێنەری هەست و سۆز و پووختەی زانستی دەروون و پزیشکی و زانیاری توێژینەوە و بیرتیژییە[4]، مەلا ڕئووفی خادم سوجادە خۆی بە شاگردی حەزرەتی خانی و حەزرەتی

[1] ئیدریس عەبدوڵڵا مستەفا: قۆناغی پێش ڕۆمانسیزمی شیعری کوردی (١٨٥١-١٩٢١)، (هەولێر، بڵاوکراوەی بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی ڕۆشنبیری هەولێر،٢٠٠٦)، ل٣٩ و ٤٠

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٧

[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣

[4] ڕێزان ساڵح مەولوود: ئەندێشەی شیعریی لەنێوان ڕێبازی کلاسیك و ڕۆمانتیکی کوردی لە کرمانجی خواروودا، (هەولێر، چاپخانەی شەهاب، چاپی یەکەم، ٢٠٠٩)ل٢٨و٢٩و٣٠.

حاجی قادری کۆیی زانیوە، ڕەنگدانەوەی شیعرەکانی بەڵگەن کە تێیدا ڕای خۆی دەربڕیـوە، بەرچنـە سرۆشـانی شـیعری لـێ هەڵچنیـوە.

## ئایین و نیشتمان:

لە کۆی ٢٣ پارچە شیعر و دە چوار خشتەکی لە بەشە کوردییەکەی دیوانەکەی، دەردەکەوێ چەند تێکۆشەر و دڵسۆز بووە بۆ کورد و کوردستانەکەی، ٦٨ جار ناوی کورد و ١٨ جار ناوی کوردستانی بەکارهێناوە، باوەڕ و خۆشەویستی نیشتمانی بە ئایین و کوردپەروەری گرێ داوە، لە گوڵدەستەی هاوزەمان و هاوزەمانی شاعیرانی کورد، لە رووی نیشتمانییەوە پێشەوایە بە بەراورد، زۆربەی شاعیرە کۆنەکانی کورد لە حوجرەی فەقێیان خوێندوویانە بوونەتە مەلا و میرزا و خوێندەوار[1]، بەڵام مەلا ڕەئووفەفەندی کولێژی حقوقی تەواوکردووە[2] لەو پەڕی پێشکەوتن و ژیار، ڕاهاتووی زارگەلی وتە و گوزارشتی بێگانە، کەچی بیرۆکەی کوردی ون نەکردووە لەو چەرخ و زەمانە، وشە گەشە شیعرەکانی بە نیشانە.

ئیمانم هەتا ئەبەد،هەر بە ئایەی قورئانە[3]
گەرچی وێردی زوبانم هەر ناوی کوردستانە
ئەی خالق نەجاتمان دەی، لە مەحبوسی زیللەتا
عەزابی قەلب و جەسەد،هەر تانەی دوشمنانە
بەدی ناکام حوڕییەتی، ئەفکار و وجودی کورد
عیلاجی دەردی جەهل، هەر لە دەستی خۆمانە
تا جاهیل و ڕووسیا بین، بە ئەقوالی نابەجێ
ئاقیبەتمان تیری وان، سینەی ئێمە نیشانە
عەیبە بۆ کورد حەڵاڵی خوێنی برای خۆی بکات
کەی بەم شەخصە دەڵین کورد یا لە جوملەی ئینسانە؟

[1] ئیدریس عەبدوڵڵا مستەفا: قۆناغی پێش ڕۆمانسیزمی شیعری کوردی (١٨٥١-١٩٢١)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣.

[2] مە ڕەئووفی خادمولسوجججادەی شاعیر و زمانزان و حقوقی ئیستەنۆڵی تەواوکردووە، کتوویخانەیەکی گەورەشیان لە ماڵەوە هەبووە.

پێشڕەو سەید برایمی: (دڵدار ژیانی سیاسی)، (کۆیە، چاپخانەی سۆفیا، چاپی یەکەم، ٢٠٢٣)، ل٣٥.

[3] د.کەمال غەمبار(پێشەکی و توێژینەوە و ساغکردنەوە) و فەرهاد عەزیز خۆشناو (لێکدانەوە و شەرحی شیعرەکان)، ل٢٥٤-٢٥٥

**(ڕەئووف) هێشتا مـاویەتی میللەت بە گـــوێی دابچێ**

**قـــال و قیلی فــکری تـــۆ فەســـاحەتی زوبـــانە**

دیـن و نیشـتمانی لەیەکـی جودا نەکـردۆتـەوە، ڕوو بـەرووی سـەرکۆنە و لۆمـە و تانـە بۆتـەوە، بـەڵام بـەردەوام بانـگی ئـازادی و کوردایـەتی هـەر دادەدا، شـیعرەکانی پـەرۆشـی نیشـتمانی زۆر تێـدا.

**موفتی بە تورکی هەزار جار، فەتوای تەکفیری من بدا** [1]

**هـەر بە فیدای کورستانم، بـۆ کوردستان دەبمە فیدا**

**مەفتەنی جـد و ئەجدادم، ئەرزی پـــاکی کوردستانە**

**سەگ و حەرەسی کوردانم، سەدای منە حـەپە و نیدا**

****

پێـی وابـوو بـە یەکێتـی و تفەنـگ و قەڵـەم، کـورد قوتـار دەبـێ لـە دیلـی و سـتەم، لەگـەڵ حەزرەتـی حاجـی قـادری کۆیـی هاوبیـر و هاوشـان، شـیعرەکانیان بەڵگـەن و نیشـان:

**گەر بێت و لـە قەسیدەی من، تێ بفکرن کـــوردەکان** [2]

**لـــە غـــایەی من دەفامن، پێی نـــاوێ شەرح و بەیان**

**تفەنگ و قەڵـــەم نەسرەتی، میللەتی مەزڵـوم دەدا**

**مەعریفەتی سیلاحتان ببێ وەك جـــــەیشی یـــۆنان**

**بڕۆن دق الباب بکەن لـە سیپارەی ئـــەلف و بـــــا**

**هـەر مەخـــۆن و مەخـــەون، بێ فکر میسلی حیوان**

**دەبێ ســـــاحبی دەوڵەت بن عیلم و سەنعەت بزانن**

**بە فەننی سەنعەت کــــاری بێ خەوف بچنە مەیدان**

**بنواڕنە ئەو قەومـــــانەی ساحێب سەنعەت و عیلمن**

**ئەلعان ســـــاحب دەوڵەتن، ساحبی عەزم و ئیمان**

[1] د.کەمال غەمبار(پێشەکی و توێژینەوە و ساغکردنەوە) و فەرهاد عەزیز خۆشناو (لێکدانەوە و شەرحی شیعرەکان): دیوانی مەلا ڕەئووف، ل٣٢٨

٢ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠٣

**(رەئوف) ئەسەف قەومی كـــورد بۆی دەلییت تێ ناگا**
**بیلا خەســـــارەت مەندن شەعبی زەلیلی زەمـــــــان**

## فرچك بە كوردایەتی:

گەلانـی زینـدوو بەهـای تێكۆشـەرانی خۆیـان دەزانـن، پەراوێزیـان ناخـەن و شـانازی پێـوە دەكـەن لـێ بە مـەزن و لە ریـزی نەبەزانن، لە عەشـقی نیشـتمان و كـورد پشـكی شـێری بەركەوتـووە، لـە بەهرە و هونـەر و پەیام لە بیـر وباوەڕ بە نەتەوەیـی دەركەوتووە:

**لەو لـــــــەحزەیە دەفـــــــــامر و ددانی شیریم كەوتووە[1]**
**مـــــەجنوونم و ئـــولفەتم بە قـــــەومی خۆمەوە گرتووە**
**لەو لـــەحزەیە هەمـــــڕام لـــەگەڵ حـــەرفی (ا و ل و م) دا**
**چـــەشمەكانم لـــــەسەر صفحەی قـورئان و حافز خەوتووە**
**لــــــــەو لەحزەیە فەسڵی بەهـــــــار قـەدی لالە دەڕەقسێنێ**
**ســـــەری خــــــۆم بۆ زاتی ئەحـەد، بێ تـەڕەدود داخستووە**
**لــــــە سلوكلی غەوسی سانیم، لە بــەحـری شێخی بەستامی**
**هەمـوو عـومـرم، ڕووم لە قاپی، ئەعلایی قەدەر كـــردووە**
**كـــوردێكی بـی غەل و غەشم لـــە تەبعیی شێخی سەنعانم**
**لـەسەر مەزهەبی كـــوردستان، خۆمم دەربەدەر كـــــردووە**
**(ڕەئووف) شوعلەی عیشقی تۆیە چیاكـــــانی منەوەر كـــرد**
**لە خەلوەی زوهدی كوردستان خۆتت دەست بەسەر كردووە**

خۆشەویسـتی و بـاوەڕی نیشـتمانی وا كـەوتۆتـە سـەر، نابـێ بـێ هیـوا بـێ مرۆڤـی تێكۆشـەر، چـەك و فیدایـی دانـاوە بـۆ چارەسـەر:

---

[1] د.كەمال غەمبار(پێشەكی و توێژینەوە و ساغكردنەوە) و فەرهاد عەزیز خۆشناو (لێكدانەوە و شەرحی شیعرەكان): دیوانی مەلا ڕەئووف، ل٢٥٨-٢٥٩

قـــــەومی کـــوردە بێ عیلاج و بێ مەفەر[1]
مەحبووسە، لـە ماڵی خۆیدا خـاك بە سـەر
حقووقی چی،هەر مەرگە عەیش و نـــۆشی
خـــــودا بیبڕێ، دەستی ڕەقیبی لــــەسەر
بـــە مـــەرگی کـــورد، ئومێدەوارن ڕەقیب
بەهەر میحنەت، تـــول بکێشی هـــەتا سەر
بـا هەر میحنەت، تـــول بکێشێ هەتا سەر
فەرزە بۆ کـــورد، فیدای خـــــاکی وەتەن
دەست لـەسەر چەك، چاو لە سێرە، بەرامبەر
فـەرد و بێکەس، زار و زەلیل بـــووە کـــورد
لـــــەم عەسرەدا، بێ نـــــەوایەو بێ پدر
(ڕەئووف) نـــــابی، فەراموشی وەتەن کەین
بێ ئـــــەمـەلی، خـــــراپە بۆ ڕووحلەبەر[2]

خاکی نیشتمان پێ پیرۆز بوو، لە ناخەوە کوردپەروەر و دڵسۆز بوو، بانگی نیشتمانخوازی دەدا ڕۆڵەکانی تێ دەگەیاند، بە خۆشەویستی نیشتمان و پەروەردەیی نەتەوەیی و بۆ یەکێتی ریزەکان ڕادەگەیاند، کە نیشتمان خاکی ئەژداو و ئاباد و باوانتە:

ئەی وەتەن روحی عـــــەزیزم سەرگەردی دەورانتە[3]
خاکت سورمەیە بۆ چاوم، چاوم بە قوربــــــانتە
نەسیمت بـــۆی عەنبەر و وەك شەمیمی نێرگس جاڕە
نـــــاوت بە میسلی درێشەی دیدەی دوشمـــنانتە

---

١ حیکمەت مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە پێشەکی و پێداچوونە و ڕێکخستن عەبدوڵڵا زەنگەنە: (دیوانی زەینەب خان کچەکورد ١٩٠٠-١٩٦٣)، (هەولێر، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، ٢٠١٨)، ل١٧٨

٢ د.کەمال غەمبار(پێشەکی و توێژینەوە و ساغکردنەوە) و فەرهاد عەزیز خۆشناو (لێکدانەوە و شەرحی شیعرەکان): دیوانی مەلا ڕەئووف، ل١١٦-١١٧

٣ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤٩-٢٥٠

لــــە تۆم مەطلووبە یا رەبی حیفزی میللەتی کوردان
عەبدی تۆن رگــووت و ڕەجاڵن تۆ ڕەحمەت عینوانتە
سیاچــــــارەن لــــــە دونیادا عیبرەت وەرنـاگرن ئەبەد
ئەی کـــوردە هەر ئیتیحادە ڕێی نەسرەت و مــــــانتە
ئیتیفاق بکەن کوردینە ئیسپاتی کـــــــەن پیــــاوەتــی
تـــــــەفرەقەیە کەســــــافەت دوشمنی ئیمــــــانتە
(ڕەئووف) عومری عەزیزت رۆیی بە قال و قیل و هاوار
ســــــەرفی عومرت چییە ۆ کــــورد واجبی ســـــەرشانتە

+/مـەلا ڕەئووفەفەنـدی خـادم سـوجادە شـیعری دیکـەی زۆرە لەسـەر کـورد و کوردسـتان هـەروەك:

دڵم وەك نەی دەناڵێنێ لــــــــە حەسرەتی کوردستانم[1]
ئــــــەشکی خوێنینم دەلیلە لــە دوو دیدەی بێ ئامانم
پـــڕ لە ڕیشە دڵـــــــی زارم سەدای زەمزەمەی بولبولە
بـــە میزانی خـودا کوردم ئەو خەلقی کردوومە بە کورد
لە ئـــــەزەل تەقسیمی داوە بێ شك وەهـــــایە ئیمانم
بێ کــــــەرامەتی ئەوانەی نەهی لـــە حقوقمان دەکەن
لە زاهیردا دەڵی بــــــرام و، مەخفیش دوشمنی پەنهام
لـــــــە مـــەدی تاریخ تـــا ئەمڕۆ جەفامان کێشاوە جەفا
کەچی جەهل وای لێ کردووم هەر مەداح و سەناخوانم
لـــە مەدحی ئەو برایەی خۆم کە ڕەقیب و خوێنخوارمانە
خـۆم مایلی جەهلی خــــۆمم بە خۆم ئافەتی زەمـــــانم
ڕەئــــــووف جیلی ئێوە گـوزەشت بـــە ڕووی و بەختی بەد
خــوایە وەتەنیان حـــــــــورڕ بکەی موستەقبەلی لاوەکانم

---

[1] د.کەمال غەمبار(پێشەکی و توێژینەوە و ساغکردنەوە) و فەرهاد عەزیز خۆشناو (لێکدانەوە و شەرحی شیعرەکان):هەمان سەرچاوە، ل١٣٣

+/ لە شیعرێکی دیکە دیدە مەست و کوردستانی ئاوێتە کردووە وە دەڵێ:

نیشانەی نیعمەتی خــوایە تەبیعەتی کـــــوردستانم[1]
تەسبێحی لەبێ مەرجـــانە شەوقی مەسحەفی ئیمانم
عومرێ ئەساسی وەفابێ بــۆ قەومی کورد و کوردستان
پڕە لـــە نوری بەرەکەت، لـە سورمە و ئەشکی چاوانم
دڵم وەك کورەی حەدادی هەموو جۆشی ئـــاتەشینە
ڕەهزەنی دین و ئیمان و ســــــەوابی رووحی ڕەوانم
لــــەوحی دڵم بۆ قەومەکەم موحیتی میهر و وەفایە
بۆ ئایەتی حوسنی غەمزەت وەکـو پەرچەم پەرێشانم
کەی بێ لــە تەرەف قەدەکەت بەهاڵێنم ئەو دەستانە
زەخمم پڕ ژان و سەدایە نییە عیلاج و دەرمـــــــان
ڕەئووف تا کەی حاڵی دەبێ لە حەربی دیدە مەستانت
بڵێ سەدای شینی من دێ لـــە دەست دیدە مەستانم

****

[1] د.کەمال غەمبار(پێشەکی و توێژینەوە و ساغکردنەوە) و فەرهاد عەزیز خۆشناو (لێکدانەوە و شەرحی شیعرەکان):هەمان سەرچاوە،، ل١٦٧

## کاریگەری خانی و حاجی:

کاریگەری شیعرە نیشتمانیەکانی حەزرەتی خانی و حەزرەتی حاجی قادری کۆیی لەسەر بووە، بۆیە نۆ جار ناوی (خانی) و هەشت جار ناوی(حاجی) و سێ جار (مەم و زین)ی ناوبردووە، ڕۆچۆتە قولایی حەزرەتی خانی، بە گیانفیدایی و عەشقی نیشتمانی:

**بە قوربان و بە فیدای بم حەزرەتی ئەحمەدی خانی[1]**
**موریدی تەریقەتی ویم بە عەقیدە و بە ئیمانی**
**ئەشعار و فیکری موفیدی لە کۆیە ڕاجەلبی کردووم**
**پای خستوتە سەر قەڵەمم، دەڵێ (إقرأ) کورد زوبانی**
**(مستمر) لە بەحری فیکرا بە غەواسەی ئەودەگەڕێم**
**فەخرە بۆ من زیارەتی بۆسەی بنی کەوشەکانی**
**بێ خەوفم لە مەحوبوونی شەهدی زوبانی کوردیمان**
**تا ئەبەد شوعلەی عالیە ئەحمەدی خانی، دیوانی**
**لە موستەقبەل ئەجیالی کورد، دەبێ هەموو دەرخی بکەن**
**مەلحەمەکەی مەم و زین و بەیت بەیتی شیعرەکانی**
**(ڕەئوف) لەناو میللەتی کورد شەخسی منەوەرمان زۆرە**
**برایانی بەدرخان و پیرەمێردی سلێمانی**

بە ڕاگوزاری بە دیوانی شیعرەکانی مەلا ڕەئووفەفەندی گوزەر بکرێ و دڵسۆزی بۆ گەلەکەی دەردەکەوێ:

**چاوەکەم مەعلومە دوشمن چی لە زاتی تۆ دەوێ[2]**
**تەفرەقە و بوغز و حەسەدە، تا هیچنت دەست نەکەوێ**

---

[1] د.کەمال غەمبار(پێشەکی و توێژینەوە و ساغکردنەوە) و فەرهاد عەزیز خۆشناو (لێکدانەوە و شەرحی شیعرەکان): دیوانی مەلا ڕەئووف، ل٣١٥

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣١٣

پێت بدا تیکەیێ نــــــان و دوو قرۆشی ژەنــگاوی
ئینسانەتی و دینت دەبــــا خوداشت چەنگ نـاکەوێ
وازبێنە لــــەو زەلالەتە، سەفــــای وەقتی، وەقتی یە
خەسارەت نەفسی بێ وجدان، تا قیامەت نـــاسرەوێ
دیوانی ئەحمەدی خــــانی و حاجی قــادر نەزەرگە
عیبرەتی تەئریخ بفامە و نـــــوری فکرت دەرکەوێ
هەر بە فکر و مەعریفەتە، بەیــــانی عیلم مەنتیق
زوڵمەتی جەهل نامێنێ و شوعلەی نـــــور دەرکەوێ
تەمەننا لە خــــودا دەکا (ڕەئووف)ی خـادم سوجاد
کـورد دەسبەرداری حەسەد بێ و مەسیرەکەی پێشکەوێ

لـە زەمانـی یونـس پێغەمبـەرەوە کـورد کەوتۆتـە نـاو قورگـی نەهەنـگ[١]، هـەر هەوڵـی داوە تێکۆشـاوە بـە هەمـوو شـێوەکانی خەبـات بـە خامـە و تفەنـگ و جەنـگ، هـەر نەگەیشـتۆتە مەبەسـت، ماوەتـەوە بـێ دەوڵـەت و بنـدەسـت، لـە قۆنـاغ و زەمەنـی خـۆی بێوێنـە بـووە لـە دڵسـۆزی و نیشـتمانپەروەری، بیروبـاوەڕی کوردایەتـی و دەوڵـەتـی کـوردی وا کـەوتۆتـە کەللـەی سـەری، بـە هیمـەت و بـێ منـەت و بـێ بـاك، هاتۆتـە گۆڕەپـان وەك کوردێکـی چـاك و چـالاك، بـۆ خۆشەویسـتی کوردسـتان، گووتوویەتـی هەمـوو دەم ئامـادەم:

من بەندەیی قــەومی خۆمم کــوردێکی حەڵاڵ زادەم[٢]
خەمخۆری هــەوای وەتەن نەك مەستی جام و بادەم
حوببی وەتەنم زۆرە موخلیصم بۆ خـــاك و ئـــاب
تەرسی گوێدرێژێکی کـــورد بە شــــاری ڕۆما نادەم

---

١ ئەمین سەبری وەرگێڕان و لەسەر نووسینی خوسرەو جاف: (زولقەرنەین کوردە)، (هەولێر، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، ٢٠٢٢)، ل٢٦و٣٤

٢ د.کەمال غەمبار(پێشەکی و توێژینەوە و ساغکردنەوە) و فەرهاد عەزیز خۆشناو (لێکدانەوە و شەرحی شیعرەکان): دیوانی مەلا ڕەئووف، ل١٧٣

مـــــــاڵ و رووحی عەزیزم بە فیدای وەتەن بێ

نامەوێ دووری وەتەن عـــــــومری کەمم بە بـــادەم

مەفتەنم کوردستانە مەجنوون سیفەتی کـــــــوردم

عیززەتی نەفسم عالی، نـــــابێ خـــۆم بە فەنادەم

ئەستەمبۆڵ نەیتوانیوە کـــــــورد لـــە فکرم دەربێنێ

سیگاری تـــوتنی کۆیە بە تـــــــــاجی شاهی نادەم

(ڕەئووف) وەرەوە، کـــۆیە بـــۆ خزمەتی ئەهلی شـــار

بڵێ عەهدم وەفـــایە و لــــــە وەفـــاتان لانـــادەم

****

## کۆییایەتی و کوردایەتی:

کۆییایەتـی و کوردایەتـی کردۆتـە سـەر مەشـق و عەشـق و مـەراق، کۆیـەی بـە عاسـیمەی کوردسـتان و فیـردۆس دانـاوە بیسـت و پێنـج جـاران نـاوی هێنـاوە بـە کۆیـە و کویسـنجاق، سێ جـار هەیبـە سوڵتان و دوو جـار باواجـی و جارێـك چنـارۆك، زێدی خۆی پـێ خۆش بووە لـە نـاخ و نـاوەڕۆك، کۆیـەی جاران رابـردووی گەشـتر بوو، باری ئابووری و بوژانەوە و بیناسازی باشـتر بوو، خۆشەویسـتییەکەی بەرامبـەر کۆیـە تـۆخ کردۆتـەوە بۆیـە:

لــە زوڵمی رەقیبانی کــورد دڵم پر جەمرە و پشکۆیە[1]
قەت نەڵێن رەنگی زەعفەران بــەبێ سەبەب و بێ هۆیە
فیدای خاکی کوردستان بێ نەفەس و ئەولاد و رووحم
قەت بە تـاجی کیسرای نـادەم،هەوای چنارۆکی کـۆیە

کۆییایەتیەکـەی قـوول کردۆتـەوە بـە پایتەخـت و شـاری و شـانازی مەکـۆی نـاوداران و پێگـەی سیاسـەتمەدارانە کۆیـە، نەیشـاردۆتەوە پـێ خـۆش بـووە هـەر لەکنـی وابـووە هەمـوو دەمێـك جوانـە کۆیـە:

مەنبەعی علــــوم و فـــەن و عیرفـــانە کـــۆیە[2]
شــــاری فـــەخر و مەسکەنی خـــانەدانە کۆیە
ئــــــەوەی ببینێ دەفعەیــەك ئــادابی کــۆیی
حـــاڵیە کـە قـدوەی شـاری شـــارانە کـــۆیە
پێش خــزمەتن ئـەهلی کــــۆیە بۆ میهمانداری
تەربیەی پیاوی نــورانی و ژنی بــە ئیمانە کـــۆیە
ئامادەیی جەنگن قوربانی ئەدەن بۆ وەتەن کۆیی
قـامکی درێشـــەی چـاوی دوژمنـــانە کـــــویە

---

[1] د.کەمال غەمبار(پێشەکی و توێژینەوە و ساغکردنەوە) و فەرهاد عەزیز خۆشناو (لێکدانەوە و شەرحی شیعرەکان): دیوانی مەلا ڕەئووف، ل٣٢٤

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤٥

ئیعلانی حەرب ناکەن ئەمما بۆ دیفاعی کەرامەت
مستیان پۆڵا و رووحیان لەسەر دەستانە کۆیە
جولەکە و مەسیحی وئیسلام هەموو بە ئیجماع
عەزمیانە عەزمی باواجی و هەیبەسوڵتانە کۆیە
مومکینە تانەم لێ بدەن بڵێن زۆری تەجاوز کرد
قەسەم بە خالقی (ڕەئووف) مەردی سەر مەردانە کۆیە

هەقی کۆیەی داوە، ویژدانانە بەسەری هەڵداوە، بە ستایش بێ زیاد و کەم:

فیردەوسە، تەبیعەت و سورەتی حوسنی شارەکەم[1]
کویسنجاقە، مەفتەنی دیدە مەست و خومارەکەم
ممکن نییە ئەوەی ببینێ یەك دەفعە شاری من
ئەسیری بابل، شەیدای دەستی یارەکەم
بنوارە باغی هەنار و درەختی پڕ سەمەر
قەترە قەترەی میسك و عەترە فەصلی نەوبەهارەکەم
گوڕەی جوانییە و لە هەموو لاوە ڕەنگین
ئەنوێنن رووخیان، رۆژی حەشرە، نەفخی نازدارەکەم
کوچە بە کوچە گوڵ شەنە، عەتر و عەبیر و لالە
ناحەق نیە کۆیە، بڵێ تاریخ و ئاسارەکەم
(ڕەئووف) عەجەب هێندە مەجنونی بەعەشقی کۆییاتی
بە تەختی جەمشیدی نادەم، بۆ قەلبە زامدارەکەم

ئەوە ناگەێنی هەر کۆییایەتی کردبێ جگە لە کورد و کوردستان و شوێنی دیکەش هەستی دەبزوێنێ، چوار جار سلێمانی و یەك جار سەیوان و یەك جار ناوی قەڵعەی هەولێر و کەرکوك و قامیشلۆ و وان و جزیرە و بۆتان و حەمرین دەهێنێ.

---

[1] د.کەمال غەمبار(پێشەکی و توێژینەوە و ساغکردنەوە) و فەرهاد عەزیز خۆشناو (لێکدانەوە و شەرحی شیعرەکان): دیوانی مەلا ڕەئووف، ل١٥٩

## دەربەدەری و دەردەسەری:

مەلا ڕەئووفەفەندی لە پێناوی کورد و کوردایەتی هەڵاتووە، دەرد و نەگبەتی بەسەرداهاتووە، کە دواجار عوسمانی شکاوە، ئەو پەراوێزخراوە و لابراوە، سەرگەردان و پەڕاگەندە بووە، فەرمانڕەوایی ئینگلیزی پێ پەسەندنەبووە، گەر دەتەوێ جەستە ئازاد و بێ زیان بێ، دەبی زمانت لە زیندان بی، ئەو بێ منەت و سەربەرزانە وەستاوە بەرامبەر داگیرکەران و ڕەگەز پەرستان:

سەرم نەهێنا سوجدە،بۆ دوشمنانی کوردستان[1]
قوەتی دیفاعم ،نەبوو،غەیری ئەوەی هەڵاتم
مردن خۆشترە،لە جەوری دوشمنان و ئەسیری
زەحمەتە شەرح و بەیانی،ڕاوەنان و نەهاتم

ئاخر ناهەقی نەبووە کە گووتوویەتی بەو هۆیە:

بڕۆ رەئووف میسلی حاجی گوزەر کە لە کۆیە[2]
نەوەك لە دەستی شێخ نەبی سوك و ڕیسوابی

---

[1] د.کەمال غەمبار(پێشەکی و توێژینەوە و ساغکردنەوە) و فەرهاد عەزیز خۆشناو (لێکدانەوە و شەرحی شیعرەکان): دیوانی مەلا ڕەئووف، ل١٨٣

٢ هەمان سەرچاوە، ل٢٧٧

## دەوڵەتی کوردی:

بەو پەڕی باوەڕ و قەناعەت، لەگەڵ ئەوە بوو کورد ببێ بە دەوڵەت، حەڤدە جار ناوی (وەتەن) و نۆجار ناوی (دەوڵەت)ی هێناوە، لە ڕێگای نیشتمان و تێکۆشان قوربانی داوە، لەو پێناوە، بۆ کورد برژاو و سووتاوە، خولیا و پەیامی، خەون و مەرامی، هەر دەوڵەت بوو دەوڵەت، نەك پارچە پارچەبوون و چەند لەت، لە دڵ و دەروونی، لە بیر و بۆچوونی، ئەفسانەی قەڵەمی، خەیاڵدانی بەلەمی، بەرەو کەناری ئارامی بوون بە دەوڵەت، کورد رزگار دەبێ لە دیلی زیللەت، وای بۆ دەچوو کار و کارتی کورد یەکگرتنە، نەبوونی دەوڵەت مردنە، دەیزانی دەوڵەت بوونی چەمکی بیرۆکە و پێکهاتەی هێزە هەر پانتایی جوگرافی نیە، گەر ئاڵای سەربەخۆ و قەوارە و دەوڵەتی خۆی نەبێ هەرچەوساوە و مافی نیە، ڕای وابووە تا کورد نەبێتە قەوارەیەکی سەربەخۆی نێودەوڵەتی، هەر لە ژێر پێی داگیرکەران دەبێ بە نەگبەتی و بەشمەینەتی، هۆشیارانە دەوڵەتی کوردی لەبەرچاو و خەیاڵ بووە، کورد و وورد و ژیرانە بەسەر بابەتەکان زاڵ بووە، پێی وابوو کورد گەر نەبێ بە دەوڵەت دەبێتە گۆی بەر پێی بێگانە:

دوژمنی وەتەن بە برا مەزانە[1]
قەومی بێ دەوڵەت بەبێ عینوانە
مونتەزر مەبە بۆ لوتفی ئەوان
مەرحەمەتی وان فیتنەی شەیتانە
هەتا نەبیتە صاحبی دەوڵەت
عیزەتت نابێ لێمی بزانە
ئیسراحەت ناکەی لەبەر شەق شەقێن
ڕۆژێ تورکەکان ڕۆژێ ئێرانە

---

[1] د.کەمال غەمبار(پێشەکی و توێژینەوە و ساغکردنەوە) و فەرهاد عەزیز خۆشناو (لێکدانەوە و شەرحی شیعرەکان): دیوانی مەلا ڕەئووف، ل٢٦٢





## مەرگ:

ژیان پێشبڕکێیەکە بەرەومردن، بە کۆتا دێ خەون و خۆشی و خەم و خۆ خەریککردن، بەڵام درێغ و ئاخ لە ١٩٤٣/٧/١، چیتر مۆمی ژیانی دانەگیرسێ، بە تەمەنی ٧٣ ساڵی، دەگواستەوە هەوارگە و ماڵی، لە شاری هەولێر کۆچی دوایی دەکات لە کۆیە دەسپێردرێت بە خاك، بۆ گوڵ و درەخت دەبێتە پەینی بە پیت و خۆراك، مەلا ڕەئووفەفەندی، لێی بتۆژرێتەوە هەر چەندی، ناگاتە ئاستی پێویست، هەقی بدرێتێ بەویست، دەربارەی مەرگ و ژیان، خۆی ژیرانە کەوتۆتە بەیان، بە شێوەیەکی لۆژیکانە و ورد:

کیسرا نەبوو ئیفتیخاری بە قــــوەت و تاقی خۆی کرد[1]
خـــــزر نەبوو، بە نەبی و لــەبی بۆ ئاوی حەیات برد
کێ مــایەوە، لێرە و لــەوێ، هەر خالقی یەکتا نەبوو
تێ بفکرە کە هەر وایە،ئەوەی سەری هێنا،ڕۆیی مرد

ئەنجام مردنە چ بکەی! پەری گیانکێشان هەر دێتەخوار:

ئەشکی چاوان دەبارێنم وەك بـــــارانی فەسڵی بەهـار[2]
(رەئووف)نەکەی مەئیوس بی، لە قاپی رەببی رەحمانم

---

[1] د.کەمال غەمبار(پێشەکی و توێژینەوە و ساغکردنەوە) و فەرهاد عەزیز خۆشناو (لێکدانەوە و شەرحی شیعرەکان): دیوانی مەلا ڕەئووف ل٣٢٧

[2] هەمان سەرچاوە، ل١٣٢

## شیوەنی زەینەب خان بۆ باوکی:

زەینەب خان - (کچەکورد) پێداهەڵدان بۆ باوکی دەکات، بە ئامۆژگاری و وتەکانی ڕەوشەن و موبارەکی دەکات، پەیام و بۆچوونەکانی، بۆ ئازادی ژن و دژی نەزانی، کە شیعرەکەی سەرانسەر بەقەد بەهای گەوهەربوو:

باوکم پیاوێکی زۆر تێکۆشەر بوو[1]
بۆ حقوقی ژن عەقڵی لە سەر بوو

دەیگووت هەردووکیان بەنی ئادەمن
خاوەن دوو گوێچکە و یەك زار و دەمن

پیاو هیچی زیادی بۆ نەخولقاوە
لەدەستە و لە گوێ لە قاچە و چاوە

هەردووکیان عەقڵ و حیکمەتیان هەیە
بۆیە هاوسەرن بۆ ئەو ڕێگەیە

ئەگەر ژن سۆزی زیاتر نەبووایە
خودا منداڵی قەت نەدەدایە

دەیگووت: ڕۆڵەکەم، زۆر بەهیمەت بە
هەتاکو مردن شێرە ئافرەت بە

ببە بە ڕەمزی ئازادی ژنان
وەکو مەشخەڵ بە، بۆ ڕێگەی ژیان

[1] حیکمەت مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە پێشەکی و پێداچوونە و ڕێکخستن عەبدوڵڵا زەنگەنە: (دیوانی زەینەب خان کچەکورد ١٩٠٠-١٩٦٣)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٩

ئـەم جیلـە، یـــاخـــود جیلـی تـر دادێ
ڕەوڕەوی مــــافـی ژن دەگـــــاتــە جێ

ئەوســا کچانی، نـــازداری کــــــۆیە
هـەمـووی ڕێبواری دوای ڕێگـای تـــۆیـە

(زەیـنـەب) چیت ئـەوێ لـەمـــە زیاتـر؟
رەئــــووفـە فـــەنــدی دەتکا بە ئـــاگر

تۆش بسـووتێنە دونیـــای نەزانـی دونیای
دونیای تـاریکی و ڕێـــی پــەشیمـــانی

کچەکورد بۆ کۆچی دوایی باوکی، تنۆك تنۆك فرمێسکی، لەسەر رووی پەڕە گوڵ شەونمن، لە خەرمانە و تەبارەی کوردی گوڵەگەنمن، بە پەیڤە بە بڕشتەکانی، وشە قشت و خشتەکانی، ڕشتە مرواریین، ئاگراوی و سۆزدارین، بە تین و کاریگەرن، پشکۆی سوتێنەرن، کز کز گڕ گڕ هێمن هێمن:

شەمعی مەجلیسی کۆیە بوو، ئەو لە باوکی خانەدانی من[1]
چەند ئاوەدان و گەرم بوو، ئەو مـــاڵ و دیوەخانی من

نەوەك بڵێم باوکی من بووقەت بەلیغی وەهـــــا نەبـوو
کێ خۆی لە بەحری ئەو دەدا؟ ئای لەنووری چـــاوانی من

پڕ لە بەهرە و پڕ لە هونەر ئەگەر بڵێم وەك حــــافز بوو
حەکیمی حاڵ زانی کورد بوو، ئەو ئەرستووی زەمـــانی من

هەر لە شکۆ و شانی ئەو بـوو کـــوردایەتی و خوێندەواری
ئەسف کەوا لە دەستم چـــوو، ڕۆیی مەرجەعی ژیـانی من

---

[1] حیکمەت مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە پێشەکی و پێداچوونە و ڕێکخستن عەبدوڵڵا زەنگەنە: (دیوانی زەینەب خان کچەکورد ١٩٠٠-١٩٦٣)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٦

**گەوهەر لـــە زاری دەباری، لوتفی شیرین، کـــەلامی خـۆش**
**هەموو کـــۆیە، چـاوەکانیان وەکـــوو چـــاو و گـــریانی من**

**هەموو بە حەرف و خـــاڵەوەتەئریخی کوردی لـــــەبەر بوو،**
**ئەو لـە باوك و بـــــاپیرانی، عەللامـەی خـــۆشخوانی من**

**چەندە بۆ کۆیە،خەمخۆر بوو، شەڕی چەندین والی دەکرد**
**دوای هیلاکی، دڵخۆش دەبوو، ئەو بە شیعر و دیوانی مـن**

**بە غیری سێبەری خودا، خۆی بە هیچ کەسێ نەدەسپارد**
**عیزەتی نەفسی بـەرز بـوو، ئـەو تاق و ئەو هەیوانی من**

**ئیدی لەگەڵ کێ بسازێم کێ نازی وەفام بداتـێ؟**
**تەختیتی حاڵم بکێشێ؟ بۆ خەونی ئەرخەوانی من**

**تۆم مەلا و ئەفەندی نەبووی، ڕەئووفی خادم سوجادە**
**چ بەحرێکی پڕ عیلم بووی، ئەی زانای ئەسفەهـانی من**

**دەبێ ناوی تۆ بنووسرێ،لەسەر دار و بەردی کۆیە**
**تا بزانن،چی بوو،کێ بوو ئەو هەتاوی ئاسمانی من**

**دڵـم راسـت دەکا،کە دەڵـێ (زە ینەب) بێ دە نگ بە چاکترە**
**وەسفی (مەلا ڕەئووف) نـــاکرێ بە قـــەڵـــەم و زوبانـــی من**

دەسـتـەگـوڵـی گـەش بەدەسـتە باشـی، لەسـەر گـۆڕی دابندرێـت بـە جوانـی و باشـی، لـە دەوری خۆیـدا نەبـوو وەڵاشـی، پەیـکەرتراشـێ وێنـەی بـکێشـێ، پەیـکەری ببـێ بـکەوتـە پێشـێ، نـاو و ڕەوانـی بژێندرێتـەوە، بـە هـەرمـان و ڕێـز بمنێتـەوە.

## پوختە:

مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە موتوربەکراو لە خانەوادەیەکی خوێندەوار و ئاینیی و ڕامیاریی و ڕوناکبیریی، کەسایەتییەکی شیکەرەوە و پلان داڕێژەر بووە بۆ گەشەپێدان و پەرەپێدانی بیر و ژیری، بۆ هۆشیارکردنەوە و یەکسانخوازیی و دەوڵەتی کوردی، ئەو عەشقە دانەمرکا هەر مابوو خەون وئومێدی، جوانی و بەهای تێگەیشتنی لەکن مەلا ڕەئووفەفەندی ناوەڕۆك بووە نەك ڕووخسار، گەوهەری گەورە وجوانی و هەڵوێست وکردار خەمی بنچینەیی هەر نیشتمان و نەتەوە بووە لەناخ و دەمار، بە گوزارشت لە دڵ و دەروون و هەستی خەم و پەژارەکانی کردۆتە وێنە، هەڵوێستەکانی هەڵقوڵاوی هەست و بیروباوەڕی بوو ڕەنگی داوەتەوە وەك ئاوێنە، چونکە مێشك و دڵی هەوارگەی کۆیياتی و کوردایەتی و کۆمەڵایەتی و عاشقایەتی و زانستخوازی بووە، پێشکەوتن و یەکگرتنی گەلی کورد و دەوڵەتی کوردی ئامانج و مرازی بووە، لە بابەتی نەتەوەیی و نیشتمانییا، شۆپاژۆ و شوێن هەڵگرەوەی حاجی و خانیا، موسڵمانێکی روناك و محەمەدێکی[1] لەولاك و ڕامیاریەکی چالاك و پێشکەوتووخوازێکی بێباك و کوردێکی پاك و کۆییەکی چاك و ڕێك و بە پۆشتە و پۆشاك و مرۆڤێکی خاکی بووە، خەیاڵ قوول و فراوان و نوێخواز پێش سەردەمی خۆی کەوتبۆوە یەکسانیخوازی هەوێن و ماکی بووە، تۆمەتبار کرابوو بە قەومییەتێکی بێتام، تا دوا هەناسە بەهیوا بوو کورد بگاتە مەرام، چەهرە جەوهەر و رستە گەوهەر دیوانەکەی ئارەنگ و ڕەنگامە و سەر ڕێژ لە چێژ، ماوەردی مێژوویی و زانیاری ورد لە ڤەرێژ، لە باخی ئەدەب گوڵێکی گەورە و گەشە نەك بیرۆڤ، ڕۆدی مەردی و راخی و یاخی و شاعیرێکی ناسك و مرۆڤ، بەرهەمەکەی کەوتۆتە بەر دەستو بەرداس، پوختە دووراوەتەوە بۆ تۆژینەوە و بەرباس.

---

[1] عەتائوڵڵا حەواری نەسەب: دەقی دیوانی نالی، (بەپێی نوسخەکەی: مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس)، (تەهران: انتشارات کردستان، ١٣٨٥ هەتاوی)، ل٢٣٠

# ترنجاندن

مەلا ڕەئووف لە کتێبی ئینسایکلوپیدیای نووسەرانی هەولێر-عەبدولڕەحمان مەعرووف-بەرگی دووەم، (دەربارەی مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە) لە لاپەڕە ٨٣٢ هاتووە:

*لە کۆیە یەکەم موسڵمان بووە، کە باوکی لەلای مالمێک بە ناوی: (یەهودا)تەوراتی پێ خوێندووە، فێری زمانی عیبری بووە، ناڕەزایەتییەکی زۆری زانایانی ئایینی ئەو سەردەمە لە بەرانبەر ئەم خانەوادەیە و بە تایبەتی مەلا مەحموود بە دوای خۆیدا هێناوە ناووناتۆرەیان بۆ هەڵبەستوون.

*لە تەمەنی(١٠)ساڵیدا بۆتە حافزی قورئان.

* قەشەیەکی تایبەتی بە ناوی (قەشە یۆحەنا)ی بۆ گیراوە، کە لە دیوی ئێرانەوە هاتبووە کۆیە و ماوەیەك لە کۆیە مابۆوە و دواتر بۆ بەغدا ڕۆیشت، تەواوی ئینجیلی لەسەر دەستی ئەم قەشەیە خوێندووە.

*لە تەمەنی دوادواییشیدا زۆر جار ئەم پرسیارە ئاڕاستەی مەلا ڕەئووف کراوە بۆچی تەورات و ئینجیلت خوێندووە؟ لێی دەگێڕنەوە گوتوویەتی:(هەموو عیلمێك بۆ ئینسان زەرووره، دواتر یەك شت کۆماندەکاتەوە، هەموومان لە ئادەمین و ئادەمیش لە خۆڵە، کەسیش ناتوانێ ئینکاری ئینسان بوونی هیچ لایەکمان بکات)

*زۆر جاریش کە خەڵکانێك ویستویانە غەدر لە جوولەکە و مەسیحییەکان بکەن یان لە کار و مامەڵە پارەیان لێ خواردوون، مەلا ڕەئووف داکۆکیکاری سەرسەختیان بووە و دیفاعی لێ کردوون و مافی وەرگرتوونەتەوە و پشتگیری کردوون.

*هیچ کات مەجلیسی دیوەخانەکەی یاخوود ژووری دانیشتنی مزگەوتەکەیان بێ میوانداری و تێکەڵاوی کەسایەتی ئەدەبی و زانای ئیسلام و جوولەکە و مەسیحی نەبووە، بەردەوام حاخام و مالم و قەشە تەواجودیان هەبووە، تاکە کەس بووە لە بۆنەی ژن مارەکردنی جوولەکە و مەسیحییەکان

ئامادەبـوو و داوەتدەکـرا. دەگێڕنـەوە لـە داوەتـی نـان خواردنـی ماڵـە جوولەکـە و مەسـیحییەکان هـەر لـە ماڵەکانـی ئەوانـدا لـە کاتـی نوێـژدا نوێـژی خـۆی کـردووە.

*لە هەولێر و کۆیە گەورەترین کتێبخانە لە ماڵ و مزگەوتەکەی ئەواندا هەبـووە، خەڵکـی خوێنـدەوار و زانایـان و ئەدیبانـی ئـەو سنـوورە و شـوێنی تریـش، سـوودیان لـێ بینیـوە، زۆرتریـن و کۆنتریـن کتێـب و دەستنووسـی شـاعیرانی کورد و نووسـەرانی ئیسلامی تێدا بووە، و بە جۆرەها ناونیشان.جگە لە کتێب و دەستنووسـەکانی سەردەمی باوك و باپیر و باپیرە گەورەکانی، مەلا ڕەئووف خۆشـی زۆرتریـن پارەی بۆ کتێب کڕین تەرخـان کـردووە و بـە بەریـد و پۆسـتە لـە لبنـان و سـوریا و میسـر و هینـد و بەغدا و تـاران بـۆی دەهاتـەوە قەسری مـەلا فەنـدی هەولێـری خاڵۆزای و دواتـر بـۆی دەهاتـە کۆیـە.

*ئاوارەیـی و دەربـەدەری زۆری دیـوە و چەنـدان جـار لـە یەکێتـی سـۆڤێت، ئەسـتەنبوڵ و ئێـران و عێـراق زیندانـی کـراوە.

*دانووی لەگـەڵ ئینگلیز نەکولاوە، بۆیـە لـە سـەردەمی ئـەوان زۆری دەربـەدەری و مەینـەت بینیـوە.

*ئـەم شـوێنانەی دیـوە و گەڕاوە:(لبنـان، شـام، ئەسـتەنبوڵ، یۆنـان، فەڵەسـتین، یەکێتـی سـۆڤیەت، فەڕەنسـا، ئێـران، حیجـاز)

شـاعیر و نووسـەر و زمانـزان و ڕووناکبیرێکـی زۆر بـە توانـای سـەردەمەکەی خـۆی بـووە.

هەر لە هەمان سەرچاوە لە لاپەڕە ٨٣٢ نووسراوە:

هاوسـەرگیری لەگـەڵ زەهـوە خانـی کچـی خورشـیدەفەندی کـردووە، خورشـیدەفەندی ئامـۆزای بـاوك بـرای حاجـی قـادری شـاعیرە و لەسـەردەمی عوسـمانییەکان قائیمقامـی بـووە، یەکمجاریـش کـە قوتابخانـە لـە کۆیـە کرایەوە خورشیدە فەندی کردیەوە و خانووەکەی خۆی بۆ قوتابخانە قوتابیانی کۆیە تەرخانکردووە. مەحمـوودە فەندی باوکیشی لەگەڵ حاجی قادر پورزای یەکتـرن و دایکیـان خوشـکە، بۆیـە هـەم دڵـدار و هەمیـش زەینـەب خـان دەڵێـن

دایکمان لە بنەماڵەی حاجی قادرە.

*زەهوەخانی خێزانی مەلا ڕەئووف، ژنێکی خوێندەوار و دینداربووە، بەرهەمی هاوسەرگیریشیان: (زەینەب خانی شاعیر، عەونی، سەعدی: دەرچووی حقوق بووە، ئاسەف: هەردوو کۆلێژی هەندەسە و حقوقی تەواوکردووە، حەمید: خوێندنی تەواوکردووە، دڵداری شاعیر: دەرچووی حقوق سیاسەتمەدار و ڕوناکبیر، فاتمەخانی خوشکە بچوکیشیان لەسەر دەستی باوکیان و زەینەب خانی خوشکی خوێندویەتی).

گەر سەیری هەردووشیعری مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە و زەینەب خانی کچی بکەین دۆستایەتی و ئاشنایەتیان بەهێزبووە، زەینەب خان – کچەکورد دەڵێ:

## بۆ کۆچی دوایی پیرەمێردی شاعیر[1]

پیرەمێرد چرای عیلم و زانین بوو
حەیف و مخابن زوو کوژایەوە
حاجی توفیق هەمزەاغای مەسرەف
کۆچی ناوادەی دەنگی دایەوە

****

نووری قەڵەمی ئەو هەر دەمێنێ
بەویقارەوە لە دیوانی کورد
کەسی فەلسەفە جێبێڵێ بۆمان
کێ هەیە بڵێ ئەو ئینسانە مرد

****

ئەهاتە کۆیە سەردانی باوکم

---

١ حیکمەت مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە پێشەکی و پێداچوونە و ڕێکخستن عەبدوڵڵا زەنگەنە: (دیوانی زەینەب خان کچەکورد ١٩٠٠-١٩٦٣)، (هەولێر، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، ٢٠١٨)، ل١٨١
بە مناسەبەتی وەفاتی حاجی توفیق پیرەمێردم نووسیوە، کە ڕەفیق و دۆستی زۆر نزیکی مەلا ڕەئووفەفەندی خادم السجادی باوکم بوو.

کەبابی کۆیە گەلێ پێ خۆش بوو
حەیف و مخـــابن بـۆ زاتێکی وا
لە مامە یارە مات و خامۆش بوو

****

کە حـــاجی تـــۆفیق دەهـــاتە ماڵمان[1]
گـــەرمی دیوەخـــان زرمەی لێ دەهات
پیاو مـــاقـوڵی شـــار دەوریان دەدا
هەر قسە خۆش بوو شەو تا ڕۆژهەڵات

****

دەمێ بە شیعر و دەمێ گاڵتە و کەپ
پیاو ماقووڵان و شـــاعیرانی کـــۆ
مـــەجلیسیان هێند دەڕازانـــدەوە
بـــەیانیان دەبووە گوڵبارانی کـــۆ

****

هـــەتـا حـەفتەیـەك لـــەبـەر پیرەمێرد،
لە ماڵ بوو بۆ ئەو ماڵ دەعوەتکاری بوو
کە حـــاجی تـــۆفیق دەگـــەڕایـــەوە
مـــاڵئاوایی ئـــەو خـەفەتباری بـــوو

****

ئیستاکەش حەیف و نـــاشکوری نەبی
چی بکەم؟ کە لاشەی بە قیمەتی ئەو
بـۆ هەتـــا هەتـــا لێمان بـــزر بێ و
چـــاوی ڕووناکی تەسلیم بوو بە خەو

---

١حیکمەت مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە پێشەکی و پێداچوونەوە و ڕێکخستن عەبدوڵڵا زەنگەنە: (دیوانی زەینەب خان کچەکورد ١٩٠٠-١٩٦٣)، (هەولێر:چاپخانەی ڕۆژهەڵات، ٢٠١٨)، ل١٨١

+/دەبێت بە هۆی ئەو شیعرەی بەسەری هەڵگووتووە دۆستی نزیکی ماڵی مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە بووبێ، مەلا ڕەئووفەفەندی و زەینەب خانی کچی، هەردووکیان شیعریان بەسەر پیرەمێرد دا هەڵداوە، پیرەمێرد بە چەندان ناو و نازناو شیعری بڵاوکردۆتەوە ڕەنگە بۆ ئەوە زیاتر بگەڕێتەوە چونکە خاوەن ڕۆژنامەی (ژین) و (ژیان) بووە نەیویستووە دووبارە بێتەوە ناوی، جگە لەوەش مەبەستی خۆی هەبووە ئەم ناوانەی بەکارهێناوە، هەروەك: (دەباشانی، بێسارانی، زیاد، وشیار، زەرگەتەیی، پێنجوێنی، زەردەشتی، ئەبول وەفای کوردی، شێخ ئەبول وەفا، کوێخا ڕەمەزانی و رمزیاری، زەمهەریر، بێ نەوا، مامە خەمە، کەس نەزانی، ئیدمان، بێ ناو، تەراتەوەند، ماوەتی، فائق توفیق، وێڵەدەری، سەنعەتی کۆن، پێوەری، کۆنە فرۆشی، ئافاتی، عەزیزی، ئەحەی چاو، پەروین مستەفا، ژیانی خۆشەویست، بێکاری ستەم دیدە، تازە دێوانە، شاعیرێکی نەناسراو، خاك و خۆڵی، زەردیانی، عیزەت محێدین، قەرەتۆغانی، دوکانیانی، ئیجتماعی، باڵان تەرانی، ئازەر کەدەی، پیروەیسی خەڵك، زەڵمی، شەفیع، داخی، داخی بەراست) نە بەناوی پیرەمێرد و نە بەوناوە خوازراوانەوە شیعرێکی تێدانییە بۆ مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە گوتبێت! بەرچاومان نەکەوتووە گەر ئەو دۆستایەتی و ئاشنایەتیان وا بەهێز بووبێ، جێی گومان و تێروانیینە بە چی هۆکارێك ناوی نەهێناون دەشبێ شیعرێکی بەسەر هەڵدابێ یان لە ئاستیان بێ وەفا بووە، یان بۆ بەدبەختی مەلا ڕەئووفەفەندی خام سوجادە دەگەڕێتەوە، ئێمە چەند گەڕاین نەمان دۆزییەوە.

*لە ساڵی (١٩٠٨)، لەگەڵ شەریف پاشای خەندان و ئەمین عالی بەدرخان و شێخی شەمزینی و چەند کەسێکی دیکە کۆمەڵەی (تەعالی تەرەقەی کورد) دادەمەزرێنن.

*لە ساڵی (١٩٠٩)لەگەڵ شەریف پاشای خەندان دەچێتە پاریس و دوای ساڵێك دەگەڕێتەوە بۆ ئەستەنبوڵ.

*بە حوکمی ئەوەی مەلا ڕەئووف پەیوەندییەکی قووڵی لەگەڵ میرجەلادەت بەدرخان و کامەران بەدرخان هەبووە، لە ساڵی (١٩٢٧-١٩٢٨)، لەگەڵ زەینەب خانی کچی و سەعدی و ئاسەفی کوڕی و سەعیدئاغای سەید عومەراغای

زاوای چوونەتە بەحەمدوون لە لوبنان بۆ دامەزراندنی کۆبوونەوەی (خۆیبوون)، دواتر لەگەڵ کۆمەڵێک کەسایەتی گرنگ بەشداربوونە وەك: (حاجۆ ئاغا هەڤێرکی، قەدری بەگ جەمیل پاشا، جەلادەت بەدرخان، عومەراغای شەمدین، دکتۆر خدر، دکتۆر نافز زاوای برای نورەدین زازا، عەلی ئاغا زولفۆ، ئوسمان سەبری، سەڵاح زولفۆ، چەند کەسایەتیەکی دیکە)، لە ماڵی عومەراغای شەمدین لە شام.

*دواتر هەر لەم ساڵەدا هەر ئەو دەستەیە لە شام کۆبوونەوەی دووەمیشیان کردووە.

*زمانەکانی: کوردی (دایك)، عەرەبی، فارسی، تورکی، عیبری، فەرەنسی، ئینگلیزی زانیووە.

*کە باوکم پێوەندییەکی نزیکی لەگەڵیاندا هەبوو، هەروەها خانەوادەی خادمولسوجادە، باوکم دۆستایەتی لەگەڵ مەلا ڕەئووفەفەندی زۆر خۆش بوو، لەگەڵ کوڕەکانی: سەعدی و ئاسەف، هەروەها (زەینەب خان)ی کچە گەورەی مەلا ڕەئووف، باوکم بۆی باس کردووم کاتی خۆی لەسەر دەستی ئاسەفی مەلا ڕەئووف چووەتە ڕیزی حزبی هیوا، هەروەها دەیگووت یەکێك لە دامەزرێنەرانی خۆیبوون و کۆمەڵەی دارکەر و حزبی هیوا، زەینەبی کچی مەلا ڕەئووفەفەندی خادمولسوجادە بووە، ئەو ژنێکی خاتوون و قسە لەڕوو بوو،(زەکی ئەحمەد)، (جەمعیەتی عیلم و عیرفان)یان لە کۆیە دامەزراند بۆ خزمەت و یارمەتیدانی قوتابیان و فەقێکان و پێگەیاندن و ڕزگارکردنیان.

عەبدولرەحمان مەعرووف: (زەینەب خان کچەکورد لە ویژدانی چەند کەسایەتییەکدا)، (هەولێر، گۆڤاری ڕامان، ژمارە (٢٧٨/٢٧٧) لە ١١/٥-٢٠٢٠/١٢)، چاوپێکەوتنی: جەودەت سەعید:(١٩٣٠)، مامۆستای خانەنشین، دانیشتووی سلێمانی، ل٥٩.

*من بۆخۆم لە ساڵی ١٩٣٤ لە شاری کۆیە لە گەڕەکی بەفری قەندی لەدایك بووم، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیم لە کۆیە و هەولێر تەواوکرد و بۆ دواناوەندی ڕۆیشتمە کەرکووك، لەوێ خوێندنم تەواوکرد، بۆ خوێندنی کۆلێژی پزیشکیش لە بەغدا دەستم بە خوێندن کرد، دواتر بۆ

بەدەستهێنانی بڕوانامەی بەرز لە بەشی نەشتەرگەری ڕۆیشتمە ئینگلتەڕا، باوکم لە کۆیە مامۆستا بوو زۆرجاریش(فایق بێکەس)ی شاعیر، میوانی ئاسەفی خادمولسوجادە دەبوو، شەوان باوکم و مامۆستاکان لە ماڵی مەلا ڕەئووفەفەندی خادمولسوجادە کۆدەبوونەوە، دیوەخان و ماڵی مەلا ڕەئووف خادمولسوجادە میوانی زۆریان بەسەرەوە دەهات و هەتا میوانەکان زۆربەشیان لە دەرەوەی کۆیەوە دەهاتن، لە هەموو شار و گوند و شارۆچکەکانی کوردستان دەهاتن، هەتا لە سابلاغ و شنۆوەش دەهاتن، زۆرترین میوانیان خەڵکی ئەفەندی و خوێندەوار و ڕۆشنبیر بوون، لە ناو خێزانەکەشیان کرانەوە هەبوو تاکە ژنی سەر ڕووت بوو، جلوبەرگی وەکو ژنە بەغدادییەکان بوو، بە تەنیاش سەردانی دەرودراوسێکانی دەکرد، پێوەندییەکی بەهێزیان لەگەڵ ماڵی عوسمان عەونی شاعیردا هەبوو، هەتا دەیگووت زەینەب خان زۆر لە ئاسەف و دڵدار شاعیرتر و تێگەیشتووترە، سیاسی تر و قەومی تر بوو، لەکاتی مردنی(زەینب خان) یشدا، باوکم و دایکم ڕۆیشتنە هەولێر بۆ تازیەکەی، باوکم هەتا مردیش هەر دەیگووت نازانم بۆ هیچ دیوانێکی زەینەب خان چاپ نەکرا، دەیگووت ئاسەفیش ناوی نییە، بەڵام زۆر لە دڵدار موهیمتر بوو، (سەعدی)ش بە هەمان شێوە هێندەی مەلا ڕەئووف زیرەك و دنیادیدە و قسە خۆش و سادە و کراوەبوو، دنیایەك شیعری شاعیرانی لەبەربوو، خۆیشی شیعری جوانی دەنووسی، بەڵام بەداخەوە نازانم نووسینەکانی مەلا ڕەئووف چییان بەسەرهات!؟

عەبدولرەحمان مەعرووف: (زەینەب خان کچەکورد لە ویژدانی چەند کەسایەتییەکدا)، (هەولێر، گۆڤاری ڕامان، ژمارە (٢٧٧/٢٧٨) لە ١١/٥-٢٠٢٠/١٢)، چاوپێکەوتنی: د.ئەحمەد عەزیز شوان، ل٦١ و٦١.

*کچێکی (٦) ساڵان خوێندن لە بەغدا تەواوبکات و سوارچاکێکی ئەسپ سوار بێت و تفەنگچی و نیشانەشکێن بێت، دیارە بۆ ئەو ڕۆژگارە چەندە گرنگە؟ لەلایەکی دیکەشەوە مەلا ڕەئووفی خادمولسوجادەی باوکیشی شاعیر و زمانزان و حقووقی ئەستەنبوڵی تەواوکردووە و ئەو کتێبخانە گەورەیەشیان لە ماڵەوە هەبووە، دواتر زەینەب خان لە هەموو بوارێکدا ئافرەتێکی نوێخواز بووە، زۆر هەوڵی بۆ گۆڕینی کۆمەڵگا داوە، لە مێژووی

کۆیە یەکەم ئافرەتی سفووری کۆیە بووە. زۆر کەس مێژووی شارستانییەتی کۆیە دەزانێت، زەینەب خان نیشانەی ڕەوتی پێشکەوتنی کۆیەیە.

عەبدولرەحمان مەعرووف: (زەینەب خان کچەکورد لە ویژدانی چەند کەسایەتییەکدا)، (هەولێر، گۆڤاری ڕامان، ژمارە (٢٧٧/٢٧٨) لە ٥/١١-٢٠٢٠/١٢)، چاوپێکەوتنی: حاکم نازم حەوێزی، دانیشتووی سلێمانی، ل٦١و٦٢.

*باوکم کەسێکی دنیادیتە و زۆر گەڕاو خاوەن ئەزموون بوو، زانیارییەکی زۆری لە بارەی شیعر و ئەدەبیاتی فارسی کۆندا هەبوو، بە قسە خۆشەکانی مەجلیسی دەڕازاندەوە، باوکم لە ساڵی ١٩٥٠ لە کۆیە وەفاتی کرد و لە گۆڕستانی عارەبیان (باسکی عارەبیان) بە خاك سپێردرا، لە دوای وەفاتی باوکم، لە ساڵی ١٩٥٤ ماڵمان ڕۆیشتە هەولێر و هەر ئەو کاتەی ماڵمان لە کۆیە بوو لە بەغدا حقووقم تەواوکرد، لە هەولێر ماوەیەك کاری پارێزەریم دەکرد و دوای دوو ساڵ ڕۆیشتمە بەغدا، خادمولسوججادە و دیوەخانی مەلا ڕەئووفی خادمولسوججادەی دەکرد، جاری واش هەبوو لە بیرمە بە دەیان جار لە خزمەتی باوکم چوومەتە دیوەخانی ماڵی مەلا ڕەئووفەفەندی خادمولسوججادە، تەمەنم (١٥)ساڵ دەبوو کە مەلا ڕەئووف کۆچی دوایی کرد، هەموو شتێکم زۆر باش لەبیرە، لە دیوەخانەکەیان سەماوەرێکی گەورە دانرابوو، چایەچی و قاوەچی و خزمەتچی تایبەتیان هەبوو، ئەوەندەی چووبم، هەموو کات پڕ پڕ بوو لە میوان، دەمدی هەموو قسەیان دەکرد، پێدەکنین، ئەو کاتە هەستم دەکرد میوانی غەیەرە کۆیش دەهاتنە ئەوێ، بەجلوبەرگ و لەهجەی قسەکردنیان دەمزانی کۆیی نین. ژنەکەی مەلا ڕەئووف ناوی یازەهوە خاتوون بوو، یازەهوە کچی خورشیدە فەندی بوو، کە پیاوێکی بەناوبانگ و ناوداری کۆیە بوو، زەمانێك لە سەردەمی عوسمانییەکان قایمقامی کۆیە بووە، خانووەکەی ئەویش کراوەتە مەکتەب، کاتی خۆی لە کۆندا بەخۆڕایی خستوویانەتە خزمەت منداڵانی کۆیە، کە تێیدا بخوێنن، زۆر باشم لەبیر نەماوە کە خورشیدە فەندی کوڕە مامی، یان بن ئامۆزای حاجی قادری کۆیی بووە.

عەبدولرەحمان مەعرووف: (زەینەب خان کچەکورد لە ویژدانی چەند

کەسایەتییەکدا)، (هەولێر، گۆڤاری ڕامان، ژمارە (٢٧٧/٢٧٨) لە ١١/٥-٢٠٢٠/١٢)، چاوپێکەوتنی: جەمیل تەها ئەسعەد، لەدایکبووی ١٩٢٨، ل٦٢و٦٣.

*ناوم محەمەد عزەت حەویزە، لە ساڵی ١٩٣٠لە شاری کۆیە لەدایك بوویمە، کۆلێژی حقووقم لە بەغدا تەواوکردووە، لە ساڵی (١٩٧٢)ەوە لە بەغدا دەژیام و پارێزەریم دەکرد، تا ساڵی ٢٠٠٣ دوای ڕووخانی ڕژێمی سەدام گەڕاومەتەوە هەولێر و لە گەڕەکی بەختیاری دەژیم، هاوسەرەکەم لە بنەماڵەیەکی عەرەبی ناوداری بەغدایین، باوکی خوالێخۆشبووم کە بە (عیزەتی یابەسێ) ناسرابوو، سەرکاری مەلا ڕەئووفەفەندی خادمولسوججادە بوو، لەسەر زەویوزاری گوندەکەیان، گوندی مەلا زیاد، من بۆ خۆم مەلا ڕەئووفم زۆرباش بەبیر دێت، پیاوێکی باڵا بەرز بوو، کەوا و سەڵتە و عەبایەکی ڕەش و جار جارە عەبایەکی سووری تاریك و سەرشانی بە سیمی زەرد نەخشابوو و هەورییەکی ڕەشیشی لەسەر دەکرد، زۆرجاریش قات و پانتۆڵ و بۆینباغ و فێسی لەسەری دەنا و پێڵاوەکانی ڕەش بوون و دەبریقانەوە، باوکم بە دایکمی دەگووت ئەوەیان دەڕواتە بەغدا، یان بۆ مووسڵ دەچێت، لەبیرمە کە لە مووسڵ دەگەڕایەوە هەموو جار یەك حەسیری خرِی گەورەی خورما و تەنەکەیەك تەحینی بۆ ماڵی ئێمە دەهێنا، ئەوکاتە ئێمە زۆر دڵمان پێ خۆش بوو، باوکم هەموو جار لە باسی مەلا ڕەئووف دەیگووت: مەلا ڕەئووف پیاوێکی زۆر بە جورئەت و سەخی تەبیعات بوو، هەندێکیش دەست بڵاوبوو، زۆری دەبەخشی، زۆرجاریش کە گوێی لە قسەیەکی کاریگەر بوایە، یان گوێی لە ڕووداوێکی حەزین بوایە، یەکسەر دەگریا، زوو زووش لە شتی ناهەق عەسەبی دەبوو،کە فایق بێکەس و گۆران دەهاتنە ماڵی مەلا ڕەئووف، لەگەڵ ئاسەفی هەموو ئێواران دەڕۆیشتنە ناو باغی تا نیوەشەو نەدەهاتنەوە، لەوێ دەیانخواردەوە، عەسرێك مەلا ڕەئووف سەردانی تەویلەی وڵاغان دەکات، دەبینی هیچ ئالیك و خواردنیان لەپێش نییە و هەردوو ئەسپ دەحیلێنن، دیارە هەموو جار ئاسەف ئالیکی داوەتە ئەسپەکان، مەلا ڕەئووف بەم دیمەنە زۆر ناڕەحەت دەبێت و دەڵێ ئەو بەستەزمانانە گوناحن، باوکم گوتی یەکسەر هەردوو ئەسپی بەرەڵای دەرەوە کرد گوتی کوڕم بڕۆ بە ئاسەفی بڵێ وا لە فلان باغن، هەردوو ئەسپەکەتان

بەرەڵلا بووە و وەرە بیانگرنەوە، بەڵام بڵێ دایکت وایگوتووە ناوی من مەهێنە.

*ئەو خانەوادەیە، ڕۆشنبیرییەکی تایبەتیان هەبوو، هەستت دەکرد جیاوازییەکی زۆر زۆریان لەگەڵخەڵکی ئەو سەردەمە هەبوو، لە جلوبەرگ و میوان و میوانداری و پێوەندییان، باوکی ڕەحمەتیم دەیگووت بۆ قەزیەی کورد تەنیا لە کۆیە نەدەمانەوە، پێوەندییان لەگەڵ کوردی باکوور و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای کوردستاندا هەبوو، پێوەندییەکی بەهێزیان لەگەڵ خانەوادەی بەدرخانییەکاندا هەبوو، بەتایبەتی میر جەلادەت بەدرخان و کامەران بەدرخان. باوکم دەیگێڕایەوە لە ساڵی ١٩٢٧، یان ١٩٢٨بووە، مەلا ڕەئووف نەبووبووە ساڵێك (زەینەب خان)ی کچە گەورەی دابووە سەعیدئاغای سەید عومەرئاغا، شاندێکی کوردی بە سەرۆکایەتی مەلا ڕەئووف خادمولسوجادە و زەینەب خان و ئاسەف و سەعید ئاغای زاوای و سەعدی کوڕی چوونەتە (بیلحەمدوون) لە لوبنان لە دامەزراندنی خۆیبوون بەشداربوونە و دواتر چوونەتە دیمەشق، بۆ ماڵی عومەرئاغا شەمدینی، کە لەوێ بۆ یەکەم جار ئاڵای کوردستان دادەنرێت، لەگەڵ کۆمەڵێك کەسایەتی گرنگ لە کۆبوونەوەکە بەشداری دەکەن.

*ساڵی ١٩٧٠ خۆم لە بەغدا لە ماڵی فازیل سەعیدئاغا تەعاروفم لەگەڵ کامەران بەدرخان کرد و زۆرمان قسە و بەسەرهاتی خۆش گێڕایەوە هەتا ئەوەی بۆ باس کردم، کە لە سەردەمی (حاجی قادری کۆیی)ەوە ئێمە پێوەندیمان لەگەڵ خانەوادەی خادیمولسوجادەدا هەیە و پێوەندیمان بەهۆی (حاجی قادر)ەوە لەگەڵ مەلا مەحمووده فەندی باوکی مەلا ڕەئووفەفەندی و دواتر لەگەڵ زەینەب خان و سەعدی و ئاسەف و دڵدار بەردەوام بووە و ئەمڕۆش پێوەندیمان لەگەڵ پارێزەر فازیل سەعیدئاغا و ڕەمزی سەعیدئاغادا هەیە و ئەوەی ئێمەی بەو ماڵباتە بەستاوەتەوە لە باوك باپیرانەوە، روحی کوردایەتی و ڕۆشنبیری بووە.

لە ساڵی ١٩٤٦ بۆ خوێندنی ئامادەیی لە کۆیەوە هاتمە هەولێر و لە تەیراوە لە ماڵی مامم دەژیام، زەینەب خان ژنێکی زۆر بە شەخسیەت بوو، دڵنەرم و لەسەرەخۆ بوو، سەخی تەبیعات بوو، هەمیشە بە زەردەخەنە بوو، لە پاك و

خاوێنیدا وێنەی نەبوو، زۆر ژنێکی مەدەنی و پێشکەوتنخواز و زۆربەی جارەکان سەری کۆت بوو، زۆرجاریش کلاوی کۆییانەی لەسەر بوو، یان چەفییەکی سادەی لەسەر بوو، تاکە ژن بوو لەسەر قەڵا بە تەنیا بڕواتە دەر و هەر بە تەنیاش لە قەڵا شۆڕبێتەوە و بچێتە گەڕەکی تەیراوە بۆ ماڵی براکانی، کە ئەو کاتە سەعدی و ئاسەف لەوێ بوون، ژنێکی زۆر ئازادبوو لە هەڵسوکەوت و هاتووچۆ، بۆ هەر کوێیەك بچووبا دەچوو، ئیدی ئەو ڕۆژگارە زۆر زەحمەت بوو ژن بێ پەچە و عەبابێت، زەینەب خان هیوایەتی کتێب خوێندنەوە بوو، دەست و کتێبی شەڕ بوو، گۆڤار و کتێبی زۆر باشیان لە ماڵەوە هەبوو، چوار دەلاقەی گەورە هەبوون پڕپڕبوون لە کتێب و گۆڤار، دۆڵابێکی دار و دۆڵابێکی ئاسنیش لە ژوورەوە بوو پڕ بوو لە کتێب، وەکو نووسین زۆرجار شیعری بە لەقەبی کچە کورد دەنووسی، باپیری شەمسەددین موفتی دەبووە خاڵی مەلا ڕەئووف خادمولسوجادە، واتە مەلا ڕەئووف خادمولسوجادە لەگەڵ مەلا فەندی دەبوونەوە خاڵۆزا و پوورزا، لە یادمە لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٣ بوو من ئەوکاتە ماڵم لە بەغدا بوو، دوو ساڵ بوو لەوێ ژنم هێنابوو، فازیل و ڕەمزی بە تەلەفۆن قسەیان لەگەڵ کردم، کە دایکمان هێناوەتە بەغدا و دەمانەوێ دوکتۆرێکی باشمان بۆ بدۆزییەوە سەردانی بکەین.

عەبدولرەحمان مەعرووف: (زەینەب خان کچەکورد لە ویژدانی چەند کەسایەتییەکدا)، (هەولێر، گۆڤاری ڕامان، ژمارە (٢٧٨/٢٧٧) لە ٥/١١-٢٠٢٠/١٢)، چاوپێکەوتنی: محەمەد عیزەت حەوێز، ل٦٣و٦٤و٦٥و٦٦.

*لە ساڵی ١٩٢٧ باوکم لەگەڵ باپیرم، واتە مەلا ڕەئووف و (زەینەب خان)ی پوورم و سەعید ئاغای زاوایان چوونەتە شام و لە ماڵی عومەر ئاغای شەمدین بەشدارییان لە کۆبوونەوەی خۆییبوون کردووە، کە تێیدا چەندان کەسایەتی وەك جەلادەت بەدرخان، حاجۆ ئاغای هەڤێرکی و قەدری بەگ جەمیل پاشا و دوکتۆر خدر و عومەر ئاغای شەمدین و عەلی ئاغای زولفۆ و دوکتۆر نافیع و برای نوورەددین زازا و عوسمان سەبری و سەلاح زولفۆ و... بەشدارییان تێدا کردووە، جاخانەوادەیەك لە کۆیە و هەولێر بڕۆنە شام، دەبێ هەستی نەتەوەییان چۆن بووبێ. ئێمە ئەوکاتە ماڵمان لە مەخموور، یان لە گوێڕ بوو،

باوکم وەزیفەدار بوو، (زەینەب خان)ی پوورم، زوو زوو دەهاتە سەردانمان و هیچ جارێك بە بێ کتێب و دەفتەر نەبوو، لە کاتی دەست بەتاڵی جارجارە لەوێ کتێبی دەخوێندەوە، دواتر لە دەفتەر شتی دەنووسی بە بیرم دێ کە سەعدی بابم لە بەغدایێ دەهاتەوە، چەند کتێب و گۆڤاری بە دیاری بۆ پوورم زەینەب دەهێنا، ئەمنیش دەمپرسی بۆ جلوبەرگ و شتی جوانت بۆ من و لەیلا و دایکم هێناوە، بۆ پووریشم ئەوانەت هێناوە، باوکم دەیگووت: پوورت شاعیرە، زیاتر بە کتێب و گۆڤار دڵی خۆش دەبێت، هەر ئەوەشی لە من دەوێت.

عەبدولڕەحمان مەعرووف: (زەینەب خان کچەکورد لە ویژدانی چەند کەسایەتییەکدا)، (هەولێر، گۆڤاری ڕامان، ژمارە (٢٧٨/٢٧٧) لە ٥/١١-٢٠٢٠/١٢)، چاوپێکەوتنی: ئەمەل سەعدی مەلا ڕەئووف، ل٦٧.

*مەلا سەعد مەلا خدر خادم سوجادە لە ساڵی ١٧٣٣ز لە کۆیە لەدایکبووە، لە ساڵی ١٨٤٤ز لە کۆیە کۆچی دوایی کردووە، لەوێ نێژراوە لە باسکی عەرەبیان، لەسەردەمی خۆیدا بێ هاوتا بووە دیارە لە دوای وەفاتی مەلا سەعد عوسمانییەکان سەرجەم دەستنووس و پەرتووك و نووسراوەکانیان[1] بۆ ئەستەنبوڵ بردوون. مەلا

[1] عەبدولڕەحمان بێلاف: (هەرچی کەلوپەلی دڵدار هەیە لەلایەن زەینەب خانی خوشکییەوە پارێزراوە، تا ئێستاش وەکو خۆی ماوە)، گۆڤاری دیوان(هەولێر، ژمارە ١٦ی ئەیلولی ساڵی٢٠٢٢، بڵاوکراوەی ناوەندی هەولێری مەکتەبی ڕاگەیاندنی ی.ن.ك)، ل٤٩.لە وەڵامی پرسیارێك نووسراوە:

(لە ڕاستیدا دەستنووسەکان هەندێکیان هی سەردەمی زانای گەورە مەلا سەعدی خادم سوجادە و هەندێکی دیکەیان هی کوڕەکەی مەلا مەحموودەفەندی موفتی گەورەی کۆیە و ئەوانی دیکەیان هی مەلا ڕەئووف و کوڕ و کچەکانیەتی. لە سەردەمی ئینگلیز، بەهۆی دەربەدەرییەوە، مەلا ڕەئووف هەندێك لە دەستنووس و کتێبەکانی فەوتان و هەندێکی دیکەشیان سووتاون، هەندێکی دیکەیان دەستاودەستی پێ کراوە و لەناوچووە، وەکو دیوانی نالی و حاجی قادری کۆیی.

ئێستەکە کتێبەکانی ئەو بنەماڵەیە نزیکەی دوو هەزار و شەش سەد دانە دەبێت، ڕەنگە کاتی خۆی یەکێ لە گەورەترین کتێبخانەکانی کوردستان بووبێت، بێجگە لە کتێبی کۆن، کۆمەڵێك دەستنووسی بەنرخیان تێدایە، کە بە زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی و ئینگلیزی و فەڕەنسی و کوردین، هەروەها چەندان نامە و بەڵگەنامە کۆنیان تێدایە. هەرچی کەلوپەلی دڵداری شاعیرە لەلایەن زەینەب خانی خوشکییەوە پارێزراوە و تا ئێستە وەکو خۆی ماوە.

•هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٠.

(بنەماڵەکەیان متمانەیان نییە، کە دەستنووسەکان بخەنە بەردەستی هەموو کەسێك، چونکە چەندان دەستنووسیان لێ بردراوە و فەوتاوە و نەگەڕاوەتەوە، لە کەشێکی ئارامدا سەرەتا دەیانەوێت ئەو دەستنووسانە سکان بکرێن، پاشان بخرێنە بەردەست لیژنەیەکی پسپۆڕی دەستەجەمعی، بۆ ئەوەی وردەکاری لەسەر بکرێت.

+دیدار لەگەڵ عەبدولڕحمان بێلاف لە ١٨ی ١٠ ی٢٠٢٢ لە هەولێر (لەلایەن بنەماڵەی خادم سوجادەوە بەشێك لە کتێبخانەکەیان دوو هەزار و شەش سەد و سێنزدە کتێبی چاپکراوە ماوە، کتابەکان کۆنن دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیست، لەگەڵ دوو سەد و یانزدە دەستنووس، کتاب و دەستنووسەکان زەینەب خانی مەلا ڕەئووفەفەندی خادم

سەعدی باپیری مەلا ڕەئووفەفەندی دەبێ ١١٠ ساڵ ژیابێ! لە کتێبی (زەینەب خان و چەند بیرەوەرییەك) ( عوسمان رەشاد موفتی) ل ١٣٣.

لە مزگەوتی خادم سوجادە دەبێت بەهۆی توانایی مەلا سەعد (لەو مزگەوتەدا نالی و سالم و مەولانا خالدی نەقشبەندی دەرسیان خوێندووە، ڕۆژگارێك ئەم مزگەوتەی بنەماڵەی (خادم سوجادە)لە کۆیە وەك ئەکادیمیایەکی گەورە بووە لە کوردستان، جاران مزگەوتێکی گەورە بووە)[1].

لەدیوانی نالی (مەلا خدری ئەحمەدی شاوەیسی مکایەڵی) لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس و فاتیح عەبدولکەریم – پیاچوونەوەی محەمەدی مەلا کەریم. ئاماژە بەوە نەکراوە کەوا حەزرەتی نالی لەکن ئامۆزای خۆی مەلا سەعد خوێندوویەتی لە کۆیە و زەینەبی کچیشی پێداوە چۆنەتە ئەستەنبوڵ و حیجاز.

*مەلا سەعد باپیری مەلا ڕەئووفەفەندی زانایەکی بەناوبانگ و عالمێکی هەرەبەرز و شارەزا بووە لە بوارەکانی تێگەیاندن و پەروەردەکردن و دەرس گووتنەوەی زانستە ئیسلامییەکان زۆر عالم و فەقێی پایەبەرزی پێگەیاندووە، لەو سەردەمە لە هەموو لایەك زاناکان روویان لە کۆیە بوو ناوی کۆیەی گەیاندە عالەمی عەرەبی و حیجاز و میسر و هیند و ئێران و تورکیا و شام، مەولانا خالیدی نەقشبەندی و مەلا خدری نالی فەقێی مەلا سەعد بوون و خزم و لەیەك ڕشتە و درەخت بوویین!

لە کتێبی (زەینەب خان و چەند بیرەوەرییەك) (عوسمان رەشاد موفتی) ل ١٣٩.

*مەلا مەحمود مەلا سەعد باوکی مەلا ڕەئووفەفەندی زانایەکی زۆر بە توانا و کاریگەر بووە لە سەردەمی عوسمانییەکان، موفتی کۆیە بووە، پیاوێکی زاهید و شارەزا بووە، شیعری جوانیشی هەبوو سێ داندراوی دیارە، هەندێ بەسەرهاتی لەسەر مێژووی کورد نوسیبوو، لەسەر مێژووی کۆیە لە سەردەمی زەردەشتییەتدا، کۆیەی بە هاوتای شارە هەرە کۆنەکانی دونیا باس کردبوو.

---

سوجادە بە شێوەیەك پاراستوونی لەناو باول و سندوقی دار و بەکارهێنانی قیڕ بۆ دەرز و کون لەگەڵ ڕاخستنی لباد و دانانی تووتن بۆ ئەوەی کرم و جانەوەر تێکی نەدا، لە ڕاستیدا جوان ماون و باش پارێزراون خۆم بەشێکم لێ دیون.

١پێشڕەوی سەید برایمی: (دڵدار ژیانی سیاسی)، (کۆیە، چاپخانەی سۆفیا، چاپی یەکەم، ٢٠٢٣)، ل٢٤

لە کتێبی (زەینەب خان و چەند بیرەوەرییەك) (عوسمان ڕەشاد موفتی) ل١٣٩-ل١٤٠.

*مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە لە دیوانەکەی بەشی فارسی جەختی دەکاتەوە کە ڕەچەڵەکی لەگەڵ حەزرەتی نالی یەکە لە بنەچەوە شارەزوورییین:

**سوگند بر تورات و انجیل و زبـورم**

**سوگند بر قران که من لبریز شورم**

****

**دیوانگی در راه تو باشد غرورم[1]**

**از نسل نالی از دیـــار شارەزورم**

واتا: سوێند بە تەورات و ئینجیل و زەبوور و قورئان لێوان لێوی ئەوین و خۆشەویستی و تینی دڵداری تۆمە.

واتا: مایەی شانازی و خۆبەگەورەزانینە کە شێت و شەیدای ڕێگەی ئەوینی تۆ بم، من کە لە وەچە و پشتی نالی و خەڵکی شارەزوورم.

*د. کەمال غەمبار بە ناونیشانی (لە خادم سوجادەوە تا مارشی ئەی ڕەقیب) لە ڕۆڵی زەهوە خان لەگۆڤاری دیوان-ژمارە ١٦ –ئەیلولی ساڵی٢٠٢٢ ل١١ نوسیوویەتی : زەهوە خان ژنێکی خوێندەوار و قورئان خوێن بووە و عەرەبی و فارسی و تورکی زانیوە، لە کۆتایی ژیانیدا بەردەوام خەریکی قورئان خوێندن و زیکر و تەقوا و ئامۆژگاری کردن بووە، بەردەوام شەونوێژی کردووە و هەموو دووشەموانیش بەڕۆژوو بووە، جاران لە کاتی پرسە و فاتیحە خوێنەکانی کۆیە لەسەردەمی زوو بەردەوام لە ماڵەکاندا وەعز و حەدیسی دەدا و ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد و دڵنەوایی دەدانەوە، ژنێکی زۆر لەسەرەخۆ و میهرەبان بووە، لەقسەکردنیشدا هەرگیز دەنگی بەرز نەکردووتەوە، کەسیش نەیدیووە بە قاقا پێبکەنێت، پێکەنینی هەر زەردەخەنە بووە.

*سامی عەوداڵ ناوی حوسەینە، کوڕی بابە ڕەسوڵە، ساڵی ١٩١٠ لە شاری کۆیە هاتۆتە دنیاوە، شاعیر ئەم ناوە لە (سامی)کوڕی نەریمان وەرگتووە

[1] د.کەمال غەمبار(پێشەکی و توێژینەوە و ساغکردنەوە) و فەرهاد عەزیز خۆشناو (لێکدانەوە و شەرحی شیعرەکان): دیوانی مەلا ڕەئووف، ل٣٧٠

کە پاڵەوانێکی ئەفسانەیی کورد بووە، عەودال، لەقەبی بنەماڵەکەیەتی کە گوندی عەودالانی دروستکردووە، زۆر عەودالی ئاین بوونە. لەناو خێزانێکی هەژار و فەقیر گەورە بووە، هەر لەتەمەنی چوارساڵیدا خراوەتە بە خوێندن، لەلای مامی مەلا محیەدین لە تەکییەی خۆیان سیپارەی خوێندووە، وە هەر لە تەکییەی خۆیان لەلایەن مەلا ئەحمەد شنۆیی وانەی ئایینی خوێندووە، لەتەمەنی حەوت ساڵیدا باوکی کۆچی دوایی کردووە، دایکی کە ناوی گوڵی بووە بە هەتیووی بە ساوەر هارپین و تەشی ڕێسان و کوورەی حەمام سووتاندن بەخێوی کردووە.

سامی دەڵێت: هەرچەندە دایکم مێردی بە مامم خەلیفە نەجمەدین کردەوە، کە بەخێومان بکات، لە تەمەنی نۆ ساڵیدا لەبەر کەوش دروویان داناوە، پاش ئەوەی فێری کەوش دروویی دەبێ، کەوش دروویی بەسەر دەچێ، دەست بە قوڕکاری و کەتیرەکردن دەکا لە ساڵی ١٩٣٥ بۆ کەتیرەکردن لەگەڵ محەمەد تۆفیق ووردی شاعیر چونەتە ناوچەی سیکەنە و سەرخان کە دەکەوێتە نێوان سنووری عێراق و ئێران، شوێنێکی شاخاوی زۆر خۆش و سەرنجڕاکێش بووە.

پاشان خەریکی پینەدۆزی دەبێ، هەتا جەنگی دووەمی جیهانی، لەدواییدا لە تەقتەق چایخانەی داناوە، حاڵی زۆر خۆش بووە. سامی دەڵێت: مەلا عومەری سۆفی رەشید کە زاواشمان بوو لە کۆیەش هەر لەکنیم خوێندبوو، لە تەقتەقیش لە ناوەڕاستی جەنگی هیتلەر مامۆستام مەلا عومەر وتی هەردەبێ بچین بۆ توتنەوانی منیش لەبەر ئەوەی مامۆستام بوو دڵم نەشکاند بوومە توتنەوان، بەم شێوەیە لە ساڵی ١٩٤٤ لەگەڵ مەلا عومەر سۆفی رەشید چوونەتە گوندی بازمۆس لە بیتوێنێ.

لە ئێوارەی ١٩٨٥/١٢/٢٠، درەختی تەمەنی ووشك بوو لە ڕەگ و پنجا.

*(حاجی توفیق بەگ مەحمود اغای هەمزە اغا مەسرەف ١٨٦٧-١٩٥٠سلێمانی) ناسراو بە (**پیرەمێرد**)، پیرەمێرد دۆستی نزیکی ماڵی مەلاڕەئووفەفەندی خادم سوجادە بووە، جەمیل سائیبی خوشکەزای کتێبی لە کتێبخانەی بردووە، کردۆتە خاتری خاڵی کە پیرەمێردە، خۆی بە خادمی ڕیشی سپی پیرەمێرد

زانیوە رۆڵەکانی زەینەب خان و سەعدی و ئاسەف و یونس (**دڵدار**) بە غولامیان دادەنێ، رازی دڵی بۆ کردۆتەوە ؟ کەچی لە کۆچی دوایی مەلا رەئووفەفەندی خادم سوجادە لە (١٩٤٣/٧/١) باسی نەکردووە، وشەیەکی بۆ کۆچی دوایی نەنوسیوە، ئاخۆ دەبێ پەیوەندی نەبێ بە عوسمانی و ئینگلیز!! چونکە شیعری هەیە بۆ مەلیك فەیسەڵی یەکەم لە (١٩٣٣/٩/٨) کۆچی دوایی کردووە شینی بۆ عەبدولواحید نوری و مستەفا پاشا موڵکی و ئەمین زەکی بەگ و مەحموداغای شیوەکەڵی و مستەفا مەزهەر و سەید عەبدولقادری سەید ئەحمەدی خانەقا و شێخ عەبدولقادری گۆپتەپەی (**سەنگاو**) گیراوە و بۆ کۆچی دوایی مەلیك غازی لە (١٩٣٩/٤/٢) بە کارەساتی ئۆتۆمبێل لە شاری بەغدا کۆچی دوایی کردووە، و جەمیل سدقی زەهاوی لە (١٩٣٧/٥/٢٧) کۆڕی بۆ بەستراوە، شیعری بۆ قارەمانانی نەمر (شێخ قادری شێخ عوبێدوڵڵا و د.فوئاد) و بە رۆژی ماتەمی عمومی داناوە (٢٤/ئایاری /١٩٢٤) و موحەمەدی حەسەن بەگی جاف، شینی بۆ شەهیدی کەربەلا و حاجی ئەحمەدی حاجی کەریمی، بۆ (**ئەفسەرانی شەهیدی ١٩ی حوزەیران**)ی نوسیووە (**عیزەت عەبدولعەزیز، خەیروڵڵا عەبدولکەریم، مستەفا خۆشناو، موحەمەد قودسی**) شێخ حیسامەددینی تەوێڵە و کاك ئەحمەدی شێخ و حاجی عەلیاغای ئاغا تەها باوکی عەبدوڵڵا لوتفی و فەیسەڵ مەلا فەندی هەولێر و شێخ عەزیزی شێخ ساڵح برای شێخ نوری شێخ ساڵح، شێخ حسیبی تاڵەبانی)داناوە و بۆ کۆچی دوایی مەلافەندی هەولێر و شێخ عومەری خانەفا و کۆچی دوایی سەید نوری نەقیب و مەحمود جەودەت، حەسەن پاشا جاف، کەریم بەگی حاجی عەولا، ئەحمەد موختار جاف، شێخ نوری شێخ قادر، هتد.. شیعری بۆ داناون لەسەر مەلا رەئووفەفەندی خادم سوجادە بۆ عیزەتی تەل و بورهان جاهید و شێخ جەنابی شێخ نوری و زەماوەندی بابا عەلی شێخ مەحمودی نەمر و هیجری دەدە و بۆ لەدایکبوونی هۆشمەندی حەسەن بەگی جاف و شێخ نوری هەولێری و جەمالاغای عەتار و شێخ لەتیفی دانساز و عەلی کەمال و بۆشەکراو خواردنەوە کچی حاجی محیدین اغا و بۆ گیپەی ئەحمەدی عەزیزاغا و سانیحەی ئەمین زەکی بەگ و مەلا عەزیزی مفتی چاو مار و حەمە رەشیدی حاجی برایم اغا و نەسرین

جەمیل سائیب شیعری بۆ داناون و باسی کردوون.

* ئەمەلی کچی سەعدی خادم سوجادە کە ئێستا تەمەنی هەشتا و پێنج ساڵە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پەیوەندی عوسمان عەونی شاعیر لەگەڵ بنەماڵەی ئێمەدا دەگەڕێتەوە بۆ باوك و باپیری عوسمان عەونی، کە ئەم بنەماڵەیە جگەلەوەی دراوسێی باپیرەم مەلا ڕەئووفەفەندی بوونە، زۆر زۆر نزیك و تێکەڵاومان بوونە، باوکم و ئاسەفی مامم و دڵداری مامم و پوورم زەینەب خان عوسمان عەونیان زۆر خۆشویستووە و کاتێ ئێمە کە باپیر و مامم و باوکمان زوو مردن من تا شوومکرد هەر لە ماڵی پوورم زەینەب خان بووین لە هەولێر، وە هەروەها منداڵەکانی ئاسەفی مامیشم و زەهوەخانی نەنکیشم و من دەمدیت کە زوو زوو عوسمان عەونی دەهاتە سەردانی نەنکم و زەهوەخان و پوورم زەینەب خان، دەستی هەردووکیانی ماچ دەکرد و ئەوانیش ڕوومەتیان ماچ دەکردەوە، عوسمان عەونی هەمووجار قوماش و دیاری بۆ ئێمە واتە کچەکانی سەعدی (من و لەیلا خوشکم) و کچەکانی مامم ئاسەف (پەروین و نەسرین و نەرمین)دەهێنا و پارەشی دەداینێ.

پوورم زەینەب خان دەیگووت: جگە لە عەونی نابێ پارە لەهیچ کەس وەربگرن، جارێکیان خزمێکمان لە کەرکوك-ەوە هات، پارەی دایە من و نەرمین-ی ئاسەفی مامم، ئێمە وەرمان نەگرت، چونکە پوورم زەینەب خان وای فێرکردبووین. گووتم پورێ ئەدی فلان کەس خزممات نییە بۆ لێی وەرنەگرین؟ گووتی: جگە لە عەونی نابێ لە هیچ کەس شت وەربگرن، عەونی مامتانە نەك خزم، بەڵێ عەونی کەسێکی زۆر شەرەفمەندبوو، من تەمەنم (٢٣-٢٤)ساڵ بوو کە پوورم زەینەب مرد، شتێك هەیە دەبێ بیڵێم من لە پوورم بیست: عوسمان عەونی شاعیر و پارێزەر ڕۆستەم جەبار و فەتاح جەبار لە دەستەی دامەزرێنەرانی دارکەر و هیوا بوون و کۆبوونەوەکانیان لەماڵی سەعیداغا لە هەولێر و لە کەرکوك لەگەڵ کاك محەمەدی خانەقادا دەکرد. پوورم زەینەب خان دەیگووت: ئەم قەڵاتەی هەولێر چۆن هەولێری پێ ناسراوە عوسمان عەونی قەڵاتی کوردایەتییە.

لەگەڵ بنەماڵەی خادم سوجادە، عەونی شاعیر دۆستێکی نزیکبووە لەو

خانەوادە، سێ شیعری هاوبەشی لەگەڵ نەمر دڵدار هەیە، یادگاری و بەڵگەی سەلمێندراو دیار هەیە، دۆستایەتی و خۆشەویستیان لەنێوانیاندا بەتین بووە، لەدوای کۆچی دڵدار زەینەب خان (کچەکورد)ی بەسەرکردۆتەوە لەگەڵیان بەوەفا و وەك هەتوانی سەربرین بووە.

کچی گەورە و نۆبەرەی مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە (زەینەب خان کچەکورد) هاوسەری سەعید ئاغای سەید عومەر ئاغای کەسایەتی هەولێر بووە، پیاوێکی ژیر و ڕۆشنبیر و بەتەکبیر و زەنگین و خانەدان و بوێر و بەرچاوتێر بووە، چوار کوڕیان هەبوون مایەی شانازی، (عەونی، فازیل، رەمزی، غازی).

سەیرە نۆبەرەی مەلا رەئووفە فەندی خادم سوجادە ناوی عەونی بووە، بەڵام بەزویی هەردوو عەونی کۆچی دواییان کردووە، عوسمانی عەونی[1] زۆر دۆستیان بووە، بۆیە زەینەب خان شیعری پێ هەڵداوە بۆتە سەرچاوەی یادگار:

---

[1] فەرهاد عەونی: عەونی لەنێو کەشکۆڵەکەی تاهیر ئەحمەد حەوێزی و چەند بابەتێکی دیکەدا، (کوردستان، ٢٠٢١)ل٣٣ و٣٤ عوسمان عەونی، کوڕی حەبیب کوڕی عەبدوڵڵا لە شاری (کۆیە) لە گەڕەکی بەفریقەندی، ساڵی ١٩١٤ لە دایکبووە، لە ساڵی (١٩٢٦-١٩٢٧) داخلی قوتابخانەی کۆیسنجق ئولا بوو، چەند ساڵێك دەوامی کرد، بەڵام لە پۆلی پێنجەمی سەرەتایی، وازی لە خوێندنی قوتابخانە هێناوە و پاشان ماوەیەك لە مزگەوتی (حتك) لەلای مامۆستا (مەلا محەمەدی مەلا ئیبراهیم) ئیمامی مزگەوتەکە هەندێ دەرسی دینی خوێندووە، وەك: عەقائید، شەرح قەواعیدی عەرەبی، پاشان بۆ فێربوونی زوبانی فارسی، لەلای مامۆستا مەلا ئەحمەی ڕەش، ساڵ و نیوێك خوێندوییەتی، لەو ماوەیەدا لەسەر دوکان یارمەتی باوکی دەدات، هەتا باوکی وەفاتی کرد، لەسەر دوکان دادەنیشت، برادەرەکانی منهاجی دەرسی پۆلی شەشی سەرەتاییان پێ دەگووت، وەکو (حەمەڕەش کە مامۆستا محەمەد حەوێز و میرزا ئەفەندی حاجی کەریم)

لەمنداڵییەوە حەزی لە دەنگی خۆش و شیعر و مۆسیقا بووە و لەسەرەتای سییەکانیشەوە دەستی بە دانانی شیعر کردووە، هەر لە عەینیساڵدا لەقەبی (عەونی) بۆ خۆی داناوە، جوانی تەبیعەت و خۆشەویستی نیشتمانیش، کاری زۆری تێکردووە، یەکەم غەزەی ئەمەیە:

ئەرێ خوداکەی جیهان ئەهەژینی

عالەم زیندوو بێ کورد بۆ ئەمرینی؟

زۆر شیعری وەتەنی هەبووە، بەڵام نەتواندراوە بکرێنە سەر کاغەز و پیشان بدرێن وەك:

ئەسڵحەی جەنگی ئەبەستم پاسی کوردستان ئەکەم

قەتڵ و عامی... وغارەتی...ئەکەم

غەزەلی دڵداریشی هەیە. خوێندنەوەی بە زۆری ئەدەبی وکوردی و فارسی و مێژووی کورد بە زۆری حەزی لە شیعری نالی و حاجی قادری کۆیی بووە، کوردی و فارسی و بە باشی دەنووسی، عەرەبیشی دەزانی و ساڵی ١٩٤٠یش ژنی هێناوە.

لەپاش وەفاتی باوکی خەریکی بەخێوکردنی دایك و برا وخوشکەکانی بووە، ووردەووردە خەریکی مامەڵە و تجارەتە، تا ئێستا بەرهەمی ئەدەبی زۆری بەهۆی گرتن و دەربەدەری و ناڕێکی هەلومەرجی کوردستان لەناوچەووە، تا ئێستا سێ دویانی بەدەست خەتی خۆی سووتاون.

عـــەونی پیاوێکە مـــەرد و وەفـــادار[1]
لێمان ئەپرسێ ســاڵی چـەندین جـــار
هــــەروەکـــوو بـــرای گیانی گیانــی
خـــانەوادەی مـــەی کەوتـــۆتە گیانی
لــەهەرکوێیەك بێ لـــە شـــار و لە دێ
بــــۆنی (ئـــاسەف)و (دڵداری)لێ دێ
عەونیی کوردپەروەر، شاعیری بەهۆش
زەینەبی خـــوشکی نەکـــا فەرامــۆش
کـــەسێکە خـــاوەن سەواد و زانـــا
سەرم لێ نـــابڕێ ئەو بەپێی تـــوانـــا
کـــە بـــاسی یـــونس دێنێتە گـــۆڕێ
دەڵێم تخوا بـــەس، بمخە نێو گـــۆڕێ
بـــا منیش بـــــمرم ســـەر بنێمەوە
لـــەدووای یونسا قەت نەژیێمەوە
عـــەونی تێئەگـــا کە دڵـــم وایە
دەڵێ خوشکەکەم کاری خـودایە
ئێمەش ئەو ڕێیە، هەر لەبەرمانە
ناوەستێ و دەڕوا ئەوە کـــاروانە
خوا بیپارێزێ عەونی کوردپەروەر
شـــاعیری زانـا و کوردی منەوەر

بۆ ڕاستی زەینەب خان ئەو شیعرەی لەسەر دایکی داناوە:

ڕۆژێکیان دایکمر بە تورکی بانگ کرد
یەك شەقازیللەی لە بنا گوێم گیر کرد

[1] فەرهاد عەونی: (دیوانی عەونی)، (هەولێر: بەرگی دووەم، شیعر و بابەتی تازە و دۆزراوەی شاعیر، چاپی یەکەم، ٢٠١٨) ل١٢٣

حاجی قادر بوو کەسی دایکی من
کورد دەریان پەڕاند بەدەستی دوژمن
نەسیحەتکەر و چاوساغی وان بوون
پەڕاگەندە بوو، جەرگی کون کون
دایکم ژنێ بوو، بە دین و ئیمان
ئەفکاری قەومی خستبووە سەرمان
دەیزانی کە کورد زوڵم لێکراوە
تاریخی دەگوت، وەك حیکایەتخوان
دەیگووت: کیژەکەم ژیر و هۆشیاربە
بۆ حەقی کوردان دەمر بەهاوار بە
ئێمە خاوەنی بابە تاهیرین
خاوەنی خانی و مەلای جەزیرین
تەئریخی ئێمە زۆر مەنەوەرە
کچیش وەکو کوڕ ئەرکی لەسەرە
دەبێ تێکۆشی بە دڵ و بە گیان
بۆ سەربەخۆیی خاکی کوردستان
غەرب بە عیلم و مەعریفەت سەرکەوت
هەر لە ڕێی عەقڵا ڕەوڕەوەی پێشکەوت
ئینگلیس بە عیلم و عەقڵی کراوە
بۆ ژێردەستی خۆی دونیای گلداوە
ئێمەش عەقڵمان با بخەینەوە کار
فێڵمان لێ نەکا دوژمنی زۆردار

حیکمەت مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە پێشەکی و پێداچوونە و ڕێکخستن عەبدوڵلا زەنگەنە: (دیوانی زەینەب خان کچەکورد ١٩٠٠-١٩٦٣)، (هەولێر، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، ٢٠١٨) ل٥٦-٥٧

*شێخی سەنعان[1]: شێخی سەنعان لە مەککە چوارسەد دەروێشی هەبوو لە ڕۆمدا کڕنووش بۆ بتێ دەبات، زانی کە خوای گەورە تاقی دەکاتەوە لەگەڵ موریدەکانیدا ڕۆیشتن بۆ ڕۆم و لە وێدا عاشقی کچێکی مەسیحی بوو، هەر چەندە دەروێشەکانی هەوڵیاندا بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم کارە بەڵام سوودێکی نەبوو، شێخ لە گەڕەکی کچە مەسیحییەکدا گۆشەگیر بوو، لەگەڵ ئەمەشدا کچەکە گاڵتەی بەو و عەشقەکەی دەکرد لە ئەنجامدا کچەکە پێی ڕاگەیاند و وتی: ئەگەر لەم خۆشەویستییدا تەواو ڕاستگۆیت، دەبێ کڕنووش بۆ بت ببەیت و قورئان بسووتێنی و مەی بنۆشی و واز لە ئاینی خۆت بهێنی، شێخ بەمە ڕازی و ملکەچ بوو، لەژێر کارتێکردنی مەی نۆشی زانستە ئایینیەکان و ڕازەکانی قورئانی لەبیر چووە وە سەرئەنجام بوو بە مەسیحی و جبەکەی خۆی سووتاند. کچە مەسیحییەکەش پێی گووت: لە جیاتی مارەیی من، دەبێ ساڵێ بەرازەوانی بکەیت، شێخ بوو بە شوانی بەراز، لەم کاتەدا دەروێشەکانی وازیان لێ هێنا و گەڕانەوە بۆ مەککە و ئەم بەسەرهاتەیان گەیاند بە یەکێ لە یار و دەروێشە گەورەکانی، ئەم دەروێشەیش دەروێشەکانی سەرزەنشت کرد و پێی گووتن: بۆچی شێختان بە تەنهایی بەجێهێشت، دووبارە هەموو بەرەو ڕۆم گەڕانەوە، ئەو موریدە پێغەمبەری لە خەودا بینیبوو، و تکای ڕزگاری شێخی لێ کردبوو، پێغەمبەر (د.خ) فەرمووبووی کە شێخ خۆی دەگەڕێتەوە موریدەکان گەیشتنە ئەو شوێنەی کە شێخ بەرازەوانی تێدا دەکات، کاتێ کە شێخ ئەوانی بینی شەرمەزار بوو، لەژێر کارتێکردنی ئەو خەوەی دیبووی دووی شێخ کەوت و لە ژێر دەستی ئەو بوو بە مسوڵمان و دوای ئەوە گیانی دەرچوو.

*(ئاشکرایە شێخی سەنعان، شێخێکی گەورە و گرانی سەردەمی خۆی بووە و خاوەن (٥٠٠) مورید و (٥٠) حەجی کردووە و تەمەنی (٨٠)ساڵ بووە، لە

[1] د.محەمەد نووری عارف: (فەرهەنگی دیوانی شاعیران(نالی-سالم-کوردی)، (هەولێر: بڵاوکراوەی کۆڕی زانیاری کوردستان، چاپخانەی دەزگای ئاراس، ٢٠٠٧)، ل٦١٣

کۆتایی ژیانیبدا عەشقی کچی فەلەیە دەبێ دوای دەکەوێ و دەچێتە سەر دینی و زنناری فەلەیی دەبەستێ و دەبێتە شوانی بەرازان و ئەنجامیش پاش سەرزەنشتکردنی لەلایەن موریدان و شێخەکەی، داوا لە خوا دەکات کە لەگەڵ کچە فەلەدا بە موسڵمانی بمرن و خوا ئاواتەکەی بەجێ دێنێ و لە بەهەشت بە یەکتری شاد دەبنەوە.

(ئاشکرایە لە نێوان داستانە جۆر بە جۆرەکانی شێخی سەنعان دا گەلێ ڕەگەزی هاوبەش و لێکچوودا هەیە، ئەوەی گرنگە ئەم داستانە لە عەشقێکی سۆفیگەری دەدوێ و خاڵە هاوبەشەکان و جوداکان لەم ڕووانە دەبینرێن:

*خەون، چوون بۆ ڕۆم، نەخۆشکەوتنی شێخ، ئامۆژگاری موریدان، مەی نۆشین، سوجدەبردن بۆ خاچ، قورئان سووتاندن، زنار بەستن، وازهێنان لە ئیسلام، بەرازەوانی، دیتنی پێغەمبەر لە خەوندا، پەسەندبوونی دوعای موریدان، گەڕانەوە بۆ ئیسلام، موسڵمانبوونی کچە و مردنی کچەکە.

*خاڵە جیاوازەکانیش: (شێوەی دیتنی کچەکە،شێوەی ئامۆژگاریی موریدان، ماوەی نەخۆشکەوتنی شێخ، کەسایيەتی هاوڕێی، شوشتن و غەسلی شێخ، شێوەی کردنەوەی زنار، شێوەی ئاگاداربوونی کچەکە لە چوونی شێخ، شێوەی بەدواداچوونی کچەکە بۆ لای شێخ بە مردنی شێخ شادبوونی شێخ و کچە بەیەکترگەیشتن لە بەهەشتدا ڤەگێری ڕووداوەکە)

*هەر لە بەشی فارسیەکەیدا زوننار و شێخ سەنعان دووبارە دەکاتەوە و دەڵێ:

**زوننار بستم از مـریدان تـــو باشم**

**مجنون چشمت شیخ صنعان تو باشم**

واتا ئێستا کە دەبینی زوننارم بەستووە بۆ ئەوەیە تاکو لە ڕێزی شوێنکەوتووانی تۆ هەژمار بکرێم، شێتی جوانی و نازی چاوانت ببم بە شێخی سەنعانت.

*لە بەشی فارسیەکەیدا موسا و کێوی تووری بەکارهێناوە:

**تو مستی موسی میان کوه گــوری**

**تو مرهم غمهای من سنگ صبوری**

واتا کاتێك کە حەزرەتی مووسا خودای پەروەردگاری لەسەر شێوەی ئاگر

لە چیای توور بینی، لە هۆش خۆی چوو و بێ هۆش کەوت، دیداری تۆ بۆ من هەر ڕێك وەکو دیداری موسا و پەروەردگارە، تۆ هەتوانی بۆ برینی دڵی و دەروونی منی.

*لەبەشی عەرەبیەکەش باسی دەوڵەتی کوردستانی کردووە:

**یارب بالمصطفی بلغ مقاصدنا**

**فی دولة اسمها یکون کردستان**

واتە، خودایە بە هەڵبژێردراوەکەت محەمەد (د.خ) مەبەستەکانمان بگەیەنە، لە دەوڵەتێك کە ناوەکەی کوردستان دەبێت.

*ڕەقیبانی لەندەهوور: مەبەست لە ناحەز و نەیاری ناقۆڵا، حەزرەتی نالی دەڵێ:

**قـــەلبی مونەووەرە لــە حەبیبانی نازەنین[1]**

**یا وەك سەقەر پڕە لە ڕەقیبانی لەندەهوور**

نالی حەریفی کەس نیە و تەبعی شەکر باری و نالی بە داوە بە مەعنایی زۆر و گەورە و کون دەکا بە و قوەتی حیکمەت و ئەدا و مسوەدەی بە ڕۆح ئاشنای سیرڕەی قەڵەم ئاماژە بۆ شیعرەکانی نالی:

**تەبعی شەکرە باری من کوردی ئەگەر ئینشا دەکا[2]**

**ئیمتیحانی خۆیە مەقسوودی لە (عەمدا) وا دەکا**

*کون دەکا بە نووك هەڵی گێرینەوە نووك دەبی بەکون، کون دەبێ بە نووك:

**ئەی شۆخی بێ نیاز و گران ناز و غەمزە سووك[3]**

**تیری موژەت نیشانەیی دڵ کون دەکا بە نووك**

****

**نالی عەجەب بە قوەتی حیکمەت ئەدا دەکـــا[4]**

**مەعنایی زۆر و گەورە بە لەفزی کەم و بچووك**

[1] عەتائوڵڵا حەواری نەسەب: دەقی دیوانی نالی، (بەپێی نوسخەکەی: مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس)، (تەهران: انتشارات کردستان، ١٣٨٥ هەتاوی)، ل٥١

[2] عەتائوڵڵا حەواری نەسەب: هەمان سەرچاوە، ل٢٣

[3] هەمان سەرچاوە، ل٧٢

[4] هەمان سەرچاوە، ل٧٣

*****

**نیشانەی پوختەگی بێ دەنگییە (نالی)! ئەگەر پوختەی**

**بە حوججەت تەی بکە نامە، بەحیددەت پەی بکەخامە**

*****

**(نالی)حەریفی کەسی نیە، ئیلف و ئەلیفی کـەس نیە**

**بەیتی ڕەدیفی کەس نیە، هەرزە نووسە و گەپ دەکا**

*****

**فارس و کورد  و عەرەب هەر سێم بە دەفتەر گرتووە**

**(نـــالی)ئەمڕۆ حـــاکمی سێ موڵکە، دیوانی هەیە!**

* حەزرەتی نالی (سەد داو)ی نایەوە، سەدای دایەوە، ئاخۆ دەبێ (بە داوە) مەبەستی هەر داونانەوە نەبێ، چونکە بە ڕێنووسی کۆن نوسراوە مانای دیکەش وەردەگرێ دەزوولەی باریکی ئەندێشە بۆ سەرە داوی ئەوەش دەڕوا کەوا (بەداوە) بەدە ئاوا بگەێنی مەبەست بە شتی خراپ نا واتە بەڵا و زیرەکە مەبەستی بێ (بەدە ئاوا) بەڵایە چونکە لە دەقی دیوانی نالی، بەپێی دەقی نوسخەکەی مامۆستای عەبدولکەریم موودەڕڕیس لە ئامادەکردنی عەتائوڵلاحەواری نەسەب، لە لاپەڕە ١٨٨ نووسیویەتی[1]: بەداو: (سەربەگۆبەند و دەم بە بیانوو و فێڵباز). حەزرەتی نالی (بە دڵ و داو)، شیعری داناوە !! بەکارهێنانی ئەتۆ و ئەمن و زوور و (دە) لە جیاتی (ئە) دەبێت کاریگەری ئەوەنە بێ خێزانەکەی کۆیی و لە بنەماڵەی خادم سوجادە بووە، ماوەیەك لە کۆیە ژیاوە بۆیە هەندێ وشەی شێوەزاری کۆیییانەی بەکارهێنابی

با گوناهبار نەبین بە مانا خراپ لێکی نەدەینەوە چونکە حەزرەتی (نالی) شیعرەکانی بە جگەرگۆشەی خۆی داناوە:

**لە جگەر گۆشەیی شیعرم مەدە مەعنایی خراپ**

**بێ خەتا کەس نییە رازی کـــە لە ئەولادی درێ**

_*مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە (١٨٧٠-١٩٤٣) سێ جاران (ئەشکی خوێنینم

١عەتائوڵلا حەواری نەسەب: هەمان سەرچاوە، ل١٨٨

دەلیلە) بەکارهێناوە، کەچی ئەحمەد هەردی شاعیر پێنج خشتەیەکی لەسەر شیعرێکی شێخ نوری شێخ ساڵح کردووە، لە کۆپلەی سێیەمدا لە (ڕازی تەنیایی) ل٢٥ دەڵێ:

وا نـــەزانی دەستی خـــەم یادت لە دڵدا دەرئەکـــا[1]
(ئـــەشکی خوێنیم دەلیلە)، بـۆ کەسێ باوەڕ نەکـــا
گیانەکەم، بەو تیشکی چاوەی شەڕ لەگەڵ ئەختەر ئەکا
(دڵ ئەبیتە قەترەیی خوێن و، لــــە دیدەم سەر ئـەکا
هـەر کە ڕابووریێ بە دڵما، سوحبەتی جـــــارانی شەو)

(ئەشکی خوێنیم دەلیلە) کەس باوەڕ دەکا لە مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە وەرنەگرت بێ.

*ناڕوونیەك هەیە ئایا حەزرەتی حاجی قادری کۆیی دەربەندییە، باجەلانییە، زەنگەنەیە، شێخ بزێنییە، پێویست دەکا لێی بتوژرێتەوە و ساغ بکرێتەوە!

چونکە خورشیدە فەندی ئامۆزای حەزرەتی حاجی قادری کۆییە (عالیم زادەن).

*زەینەب خان- کچە کورد نۆبەرەی مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە (کەسەبار) بوو، دڵداری برا گچکەی پەروەردە و بەخێو کردبوو، دایکی (زەهوە خان) لە ماڵی ئەو بووە ئاگای لە برا و خوشك و کەسە هەژارەکان بووە، مروڤێکی میهرەبان و بە سۆز و دڵۆڤان بووە.

*بنەماڵەی خادم سوجادە بە چەند سەر و خەتان دەبنە خزمی حەزرەتی حاجی قادری کۆیی، خورشیدەفەندی عالمیزادە باوکی زەهوە خانی خێزانی مەلا ڕەئووفەفەندی دەکاتە باپیری زەینەب خان و دڵدار ئامۆزای حەزرەتی حاجی قادری کۆیی بووە، خاڵەکانی زەینەب خان و دڵدار بن ئامۆزای حەزرەتی حاجی قادری کۆیی بووە، عەبدوڵلاّفەندی خاڵیان دوو کچی هەبووە دوو برای زەینەب خان و دڵدار هێناوییانە کچی خاڵی خۆیان بۆتە براژنی زەینەب خان و دڵدار و جگەلەوەش خاڵۆژنیشیان هەربۆتەوە براژنیان! (مەحموودەفەندی خادم

[1] ئەحمەد هەردی: (ڕازی تەنیایی) پێشەکی لەلایەن (معروف خزنەدار)ەوە نووسراوەتەوە لەسەر ئەرك و لەژێر چاودیری ی ((جمال خزنەدار))لەچاپ دراوە، (چاپخانەی شەفیق، بەغدا، نەورۆزی ١٩٥٧م)، ل٢٥

سوجادە بابی مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە لەگەڵ حەزرەتی حاجی قادری کۆیی دایکیان خوشك بووە بوونەتە پورزای یەکتر.

* بەرهەمەکانی مەلا رەئوفەفەندی خادم سوجادە:

ا- دیوانی ڕەئووف (مەلا ڕەئووف خادم سوجادە) بە هەر چوار زمانی کوردی، عەرەبی، تورکی، فارسی شیعری نووسیوە زۆربەی زۆری شیعرەکانی بە زمانی کوردین، دواتر چەند شیعرێکی بە زمانی عەرەبی نووسیوە، هەر لەو دیوانەدا چەند دانەیەکی بە زمانی تورکی و فارسی هەن.

ب- شەرحی مەسنەوی مەعنەوی جەلالەددینی رۆمی. شەرحانی مەسنەوی لە ئەدەبیاتی فارسی مەشهوور بوون، مەلا ڕەئووف لە بەر ئەوەی شارەزایی زۆری ئەدەبیاتی فارسی بووە، دەستی بە نووسینەوەی شەرحی مەسنەوی کردووە، هەر دوور نەرۆین لە بنەماڵەی تاڵەبانی، خالصی شاعیر کیتابولمەعاریفی بۆ شەرحی بەیتەکانی ئەووەڵی مەسنەوی نوسیووە، پێدەچێ مەلا ڕەئووف ئاگاداری ئەو بەرهەمە و شارحانی دیکەی فارس و هی دیکە بێ، بۆیە لە مەسنەویی مەعنەوی قووڵ بووەتەوە.

ت- تەرجەمەی هەندێ لە غەزەلەکانی شێخی سەعدی شیرازی و حافز.

پ- تەفسیری موبارەك خادم سوجادە بۆ قورئان، کە بریتییە لە چوار جڵد.

ج-سیرەتی حەیاتی پێغەمبەر (د.خ) بە زوبانی کوردی.

ح-سیاحەتنامەکەم

خ- عیلمی منطق بە زوبانی کوردی.

چ- مەدخەلی عیلمی کلام.

د- تەرجەمەی هەندێ لە شیعرەکانی نامق کمال لە تورکی بۆ کوردی.

ز- شیرین و فەرهادی نیزامی گەنجەوی-لە فارسی تەرجمەکراوە بۆ کوردی ١٩٣١.

ژ-شێخی صەنعان/لە فارسی تەرجەمەکراوە ١٩٣٢.

س-لەیل و مەجنون بە زوبانی سەهل.

ش- شەرحی قەصیدەی بوردییە.

## بەرهەم وچاپکراوەکانی:

نووسین و کتێب و دانراو و شیعری زۆرن و هەموویان لە کتێبخانەی قەسری باداوەی ماڵی مەلا فەندی هەولێری، کە کورە خاڵی مەلا رەئووف بوو لەوێ پارێزراوبوون و لەکاتی تاڵانکردن و سووتاندنی قەسری باداوە هەندێکیان لە هەوڵ و تەقەڵای زۆری رەحمەتی قازی رەشادەفەندی وەرگیرانەوە و کردرانەوە، زۆربەشیان لەگەڵ گرنگترین کتێب و وەسیقەی زۆر گرنگی ماڵی مەلا فەندی فەوتان و شوێنیان بزربوون.

+/لە نێوان بنەماڵەی خادم سوجادە و شێخ رەزای تاڵەبانی:

خـــــادم سجـــــادەیـــــی پیغممبری[1]
کـــەشتی جـــود و سخـــارا لـــەنـــگەری
اغنیا خـــــواهند از انعـــــامی تـــــو
سینیێ شەکـــــراو و پڵاو دوو لــــەنگەری
ئەو کەسەی خوانی لە بۆ دێ صوبح و شام
چی لـــــە ئێمە زیـــــاترە غەیرەز کـــەری؟

**واتا:**

ئــــەی نۆکــــەری بــــەرمــــاڵی پێغەمبەر
تۆ لــــــەنگەری کــەشتیی سەخـا و بەخششی
دەوڵــــــەمەندان لەنـان و نیعمــەتـی تـــــۆ
سینییێ شەکراو و دوو لەنگەری پڵاویان ئـەوێ
ئەو کـــــەسەی سینی بــــۆ دێ بەیانی و ئێوارە

چی لە ئێمە زیاترە غیرەز کەری یا کەڕی بە(کەر و کەڕ) بە رێنووسی کۆن دەخوێندرێتەوە، دوو مانا دەگەیەنێت، لەلایەک کەڕ، لەلایەکی تریشەوە کەر،مەبەستی شێخ محەمەد عەلی کەڕەیە.

[1] د.موکەرەم تاڵەبانی: (شێخ رەزای تاڵەبانی شیعر و لێکۆڵینەوە)، (هەولێر، چاپخانەی ئاراس، ٢٠١٠، چاپی دووەم)، ل١١٦

وا دیارە ئەم بگرەوبەردەی نێوان شێخ ڕەزا و خادمی سوجادە تەنیوەتەوە و شێخ ڕەزا لە شیعرێکی فارسیدا ئەم هەجوە توندەی کردووە.

خادمی سەجادە -محەمەد ڕەفیق کوڕی حاجی ئەمین کوڕی حاجی مەلا سەعدی کوڕی مەلا خدری (خادم السجادە)یە، ساڵی ١٣٨٥ کۆچی بەرامبەر ١٨٦٦ی زاینی لە شارە خنجیلانەکەی کۆیە لە دایکبووە، گەلێ نزیك بووە لە شێخ ڕەزاوە بە تایبەتی سەردەمی ژیانی هەردووکیان لە کەرکووك، ڕەفیق ئەفەندی پیاوێکی بەناوبانگ و شاعیرێکی باش بووە، گەلێ پلەی میری بەرزی بینیووە، ساڵی ١٩٢٤ بووە بە نوێنەری کەرکووك لە پەرلەمانی عێراق، بەشێوەیەکی جوان تەکیە و خانەقای، (خادم السجادە)ی بردووە بەڕێوە وەك حاجی ئەمینی باوکی و بگرە باشتر ساڵی ١٩٣٦ی زاینی کۆچی دوایی کردووە.

ئەم بنەماڵەیە، پشتا و پشت دۆستایەتییەکی قووڵ و خزمایەتییان لەگەڵ شێخانی تاڵەبانییدا هەیە، حاجی ئەمین لەگەڵ شێخ عەلی و ڕەفیق ئەفەندی و لەگەڵ شێخ محەمەد عەلی و عەلی ئەفەندی لەگەڵ شێخ جەمیل لەمە بەولاوە هیچ هۆیەك نییە کە شێخ ڕەزا ڕێزی بەرامبەر بەرماڵی پێغەمبەر (د.خ) و هێرشی توند بەسەر نۆکەرانی بەرماڵ بێنێت.

شێخ ڕەزا لەگەڵ ئەو هەموو هەجوە ناڕەوایەی ژن و ژنخوازیشیان هەبووە حاجی ئەمینی خادم سوجادە، ڕێز و خۆشەویستی بەرامبەر ئەم یادگارە پیرۆزەی پێغەمبەر (د.خ) و لە چەند شیعرێکدا سوپاسی سوڵتان عەبدولحەمید دەکات کە جێگایەکی لایەق بەم یادگارییە دروستکردووە گوتوویەتی مەبەستی (حاجی ئەمین خادم سوجادە)یە.

لە کاتێکدا تاڵەبانیەکان و خادم سوجادەییەکان تێکەڵاوی ژن وژنخوازیان هەبووە، کەچی داشۆری شێخی کردووە کە گووتوویەتی شێخ کە ... وەك خادمە سوجاد لەلای سەیدی حوڕ لە سولالەی عەلی فاتمە بێ و شێخ ڕەزای تاڵەبانی لە مێژووی دروستکردنی زیارەتگای بەرماڵی پێغەمبەر لە شیعرێکی بۆ زمانی تورکیدا ئاماژە بە ساڵی ١٣٢٣دا دەکات[1].

[1] د.موکەڕەم تاڵەبانی: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١١٤.

*بنەماڵەی (خادم سوجادە) نزیکبوون لە شێخ عەلی گەورە، چونکە دایکی حاجی ڕەفیقی حاجی ئەمین، کچی شێخ عەبدولڕەحمان بووە، واتە خوشکی شێخ عەلی و شێخ ڕەزا بووە... (دکتۆر نووری تاڵەبانی، جگە لەوەش، مامۆستا ئەحمەد تاقانە لە کتێبەکەیدا (ل١٠٤ س.پ) لە زمانی کەریم شارەزاوە ئەڵێ: (ئەم شیعرە شێخ ڕەزا و حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادە پێکەوە بۆ خادمی سوجادەی کەرکووکیان نووسیوە، لێرەدا دەبێ ئەوەمان لە بیر نەچێ، کە بنەماڵەی خادیمی سووجادە بە بنەچە کۆیین و لەوێ لقێکیان هەیە، لەوانەیە بۆ ئەوانی کۆیەیان نووسیبێ لەو کاتەی شێخ ڕەزا لە کۆیە) بووە.

*سەیرە نە لە (کۆیە و شاعیرانی) کەریم شارەزا نە لە (ناودارانی کۆیە)ی عەبدولخالق عەلائەدین، مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە و زەینەب خان- کچە کوردی تێدانیە، نە بیرمەندی گەورە مەسعوود محەمەد و نە مەلای گەورەی کۆیە باسیان نەکردوون چ ئاماژەیەکیان بۆ زەینەب خان و مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە تێدا نەکراوە، دەبی ئەو ماستە مووەکی تێدا نەبێ!!

(وەك ئەوەی بڵێ ئیرەییەك هەبێ بەرانبەر بنەماڵەی خادیم سوجادە!! چونکە کاك مەسعود بلسی زۆربەی بنەماڵەکانی کۆیە و کەسایەتییەکانی دەکا، وەك حەویزی و غەفوری و ...هتد، بەڵام ئاوڕ لە خادیم سوجادەکان ناداتەوە، پێم وایە لە کەمترین حاڵەتدا دەبوایە باسی مەلا سەعدی کردبا، چونکە زانایەکی گەورە بووە، نەك لەسەر ئاستی کوردستان، بەڵکو لەسەر ئاستی سەرجەم ناوچەکە، تا دەگاتە ناوەندە زانستە ئاینییەکانی ناو ئیستەنبۆڵ، پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی)[1].

بەڵام وەك ویژدان و مێژوو مامۆستا ئەحمەد دڵزار ١٩٢٠/١/١٨ ناوی هێناون بەو شێوەیە:

جۆرە شوێنی دی هەبوون، کە وەك دیوەخان بوون، وەك ماڵی مەلا ڕەئووفی مەحمودە ئەفەندی، خادم سوجادە، وماڵی سمایلی سەلیم ئاغا و مەلا ڕەئووفی برای و وەك ماڵی ئێمە. هەروەها هەندێك لە حوجرەی مزگەوتەکان، ئەمانە وەك سالۆنی ئەدەبی وابوون، باسی شیعر و ئەدەب و سیاسەتیشیان تێدا دەکرا،

[1] پێشڕەوی سەید برایمی: (دڵدار ژیانی سیاسی)، (کۆیە، چاپخانەی سۆفیا، چاپی یەکەم، ٢٠٢٣)، ل١٥٠-١٥١.

جار جارە لەگەڵ باوکم بەتایبەتی، لە شەوانی ڕەمەزانا بەنۆرە دەچووینە ماڵی هەردوو مەلا ڕەئووف، مەلا ڕەئووفی خادم سوجادە و مەلا ڕەئووفی سەلیم ئاغا و سمایلی برای.

مەلا ڕەئووی مەحموود ئەفەندی، خادم سوجادە، باوکی دڵداری شاعیر، پیاوێکی ڕووخۆشی پاك و خاوێنی نوکتەبازی زانا و بەسەلیقە بوو، زۆر دۆستی باوکم بوو، ماڵەوە ژوورێکی ڕێکوپێك و پڕ لە کورسی و قەنەفە و مێزی جوانی هەبوو، شەترەنج و دامە و نەرد و تەنانەت کارتی یاریکردنیشی هەبوو، زۆر مەشرەب خۆش و کوڕەکانی بەتایبەتی یوونس و ئاسە تا بڵێی وریا و زیرەك بوون، سەعدی، برا گەورەیان، کتێبخانەیەکی بەنرخی هەبوو، بە هەر سێ زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی، جگە لە هەندێ گۆڤار و دیوانە شیعری کوردیی چاپکراو و دەستنووس[1].

*لە کتێبی (کۆمەڵێك هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی دەشتی هەولێر و وراتی کۆیە) لە ل٤٨و٤٩ مەجید مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە باسیکردووە کەوا:

زەینەب خان لە زاری مەجید مەلا ڕەئووف:

(زەینەب خان دەستێکی ڕەنگینی هەبوو لە دورینی کڵاو و جلوبەرگی ئافرەتانەی کوردی و چنینەوەی ریشووەی هەوری بۆ باوك و کاکەم یونس و کاکەم سەعدی و سەعیداغا، لەگەڵ دایکم لە بەغداوە دوو مەکینەی دوورمانیان کڕیووە لە ماڵەوە بە دەرزەن جلوبەرگیان دووریووە و فرۆشتوویانە).

(زەینەب خان - کچەکورد (١٩٠٠-١٩٦٣) کتێبێکی لە دووسەد لاپەڕەی بە داستانە شیعر لەسەر مێژووی کۆیە و بنەماڵەکەیان نووسیووە بەداخەوە لەساڵی تەیاران ١٩٢٢ ئینگلیز بوردومانی کۆیەی کردووە ماڵیان سووتاوە و ئەم دەفتەرەکەش فەوتاوە)[2]

*لە کتێبی (کۆمەڵێك هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی دەشتی هەولێر و

١ ئەحمەد دڵزار: (بیرەوەریی ڕۆژانی ژیانم)، (هەولێر، چاپخانەی شەهاب، بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپی یەکەم، ٢٠١٩)، ل٣١-٣٢

٢ کۆمەڵێك هۆنراوەی فۆلکلۆری ل٤٨-٤٩

وراتی کۆیە) پرۆفیسۆری مەزن د. کەمال مەزهەر لە پێشەکیدا نووسیوویەتی:

لە دوای دوو دانیشتنمان لەگەڵ کاك عەبدول خالق لە کۆڕی زانیاری و پەیوەندیی تەلەفۆنی هاوڕێی بەڕێزم کاك مەجید خادم سوجادە، کە پێی خۆشبوو وتی دوو بەرهەمی زەینەب خانمی خوشکم داوەتە مامۆستا عەبدول خالق، یەکێکیان دەستنووسی دیوانەکەیەتی ئەوی دیشیان چەند بەرهەمێکی فۆلکلۆریە لە سەردەمی خۆی کۆی کردۆتەوە، یارمەتی مامۆستا عەبدول خالق بدە بۆ ئەوەی لە بەغدا چاپ بکرێن، کاتێ هەردوو دەستنووم وەرگرت و زیاتر لە مانگێك لەلام مانەوە و بە وردی هەردووکم خوێندنەوە، هاتەوە یادم کە بەر لەسەفەرکردنم بۆ خوێندن، کاك فازیل سەعید ئاغای کوڕە گەورەی زەینەب خان دەستنووسی شیعرەکانی دایکی نیشان دا بووم، شیعری تەڕ و پاراو و زوبانێکی شیرینی کوردی هاورێچکەی پیرەمێرد و گۆران، وەکو لە شیعرەکان وردبووم‌ەوە بیرۆکەی قوڵی فەلسەفیانە، بەڵام بە زمانێکی سادە دەتوانم بلێم سوودی زۆری لە زمانی فۆلکلۆر و لە شیعرەکانی پیرمێرد وەگرتووە، وە هەندێ وشەشی بە کارهێناوە زوبانی ڕۆژانەی گفتوگۆ بە کارهاتووە. جگە لەو بەرهەمانە زەینەب خانم زۆر دەستنووسی تریشی هەن لەلای مامۆستا مەجید، چیرۆکی منداڵان و بیرەوەری ودەفتەرێك کە پڕە لە چوارین لە ژێر کاریگەریی گوڵستان و بوستانی سەعدی شیرازی دا نووسیویەتی وە لە دەفتەرێکی تریش پەنجا شیعری نوێی لە ساڵانی پەنجاکان تا کۆچی دوایی نووسیویەتی، وەکو گوتمان دەفتەری چوارینەکان و دەفتەری شیعرە نوێکان لە دوو دەفتەری بچکوڵەدان کە لە سەر بەرگی هەردووك دەفتەر وێنەی مەلیك فەیسەڵی دووەم هەبوو.

جگە لەوەش کۆمەڵێك وتاری ڕەخنەیی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئەدەبی و مێژووی بە زمانی عەرەبی نووسیووە و هیچیان بڵاونەکراونەتەوە، لە کاتی خۆیدا بەر لە کۆچی دوایی زەینەب خانم سێ دەستنووسی دراوەتە دەست مامۆستا گیوی موکریانی، دەستنووسەکان بریتی بوون لە دیوانە شیعرێك و دوو دەستنووسیش کە بریتی بوون لە فەرهەنگێکی زۆر گرنگ بۆ زوبانی کوردی، پێشەکییەکەی لەلایەن جەنابی مەعالی (تۆفیق وەهبی) نووسرا بوو،

ناونیشانی فەرهەنگەکە بەم ناوەوە بوو (قاموسی کۆیە بو زوبانی کوردی) بۆ مامۆستا عەبدولخالقم گێڕایەوە و تەلەفۆنیشم بۆ کاك مەجید کرد کە ڕەزامەند نەبوون بۆ چاپکردن و ئەوە بوو گەیشتنەوە دەستی بەڕێزیان.

یەکەم بەرهەمی بڵاوکراوەی ئەم خاتوونەم لە گۆڤاری گەلاوێژ خوێندەوە زۆر بە تاسای دیداری ئەم شێرە ژنەی کورد بووم و دواتر لە دوای تێکەڵاویم لەگەڵ برای ڕووناکبیرم فازیل سەعید ئاغا، کە کاك هەژار موکریانی هاوڕێی نزیکی کاك فازیل بوو، بەیەکەوە سەردانی هەولێرمان کرد و چەند هەفتەیەکم مابوو سەفەری خوێندنم بکەم، بە دیداری گەورە ئافرەتی کورد زەینەب خانم گەیشتم. زۆری بەخێرهێناین، هەستم بەوە نەکرد یەکەم جارە بە خزمەتی دەگەم لە بەر زیرەکی و زرنگی و لێهاتوویی متمانەیەکی زۆر خێرام پێی کرد، وەکو فەیلەسووف قسەی بۆ دەکردین ئەوەندە پڕ مەعریفەت و خوێندەواربوو، تا ئەوساتە شتی وام نەدیبوو.

مێزێك و کورسییەکی لە ژوورەکە دانا و کۆمەڵێك کتێب و گۆڤاری لەسەر بوو، کتێبێکی دەم نخوون دانابوو دیار بوو هەندێکی لێ خوێندبۆوە، ژوورەکە بوو چوار تاقی گەورە پڕ لە کتێبی تیدابوون، لەگەڵ کاك هەژارموکریانی کەوتنە گفتوگۆیەکی گەرم دەربارەی پێشەوا قازی محەمەد، هەستم کرد ڕێزێکی زۆری کاك هەژاری دەگرت ئەویش بەهەمان شێوە بە دایە زەینەب قسەی لەگەڵ دەکرد، ئەو ژنە گەورەیەی کورد نووسین و قسەکردن لە بارەیەوە زۆر هەڵدەگرێ دەتوانم بڵێم:

(زەینەب خانم ژنێکی لێوانلێو بوو لە ئینسانییەت و مەعریفەت، لە پایەکی هەرە بەرزدا بوو نموونەی شکۆی ژنی کوردی نیشان دەدا، دەبێ هەوڵی ئەوە بدرێ توێژینەوەی ماستەر و دکتۆرای لەسەر بکرێت تا بە جیهان بڵێین ئەمەیە ژنی کورد، ئەمەیە توانا و لێهاتویی شارستانییەتی کورد).

* سەعدی مەلا ڕەئوفەفەندی خادم سوجادە، خاڵۆژنی خۆی هێناوەتەوە کە خاڵیان بەدەست ئینگلیز گوژرابوو، دوو کچی هەبووە کچەکانیش (فەخرییە) دراوە بە ئاسەفی برای و (بەهیەش) دراوە بە حیکمەتی برای (ئاسەف و حیکمەت) ئاوەڵزاوا بوون براژنیشیان خێزانی سەعدی خەسوویان

بوو کە پێشتر خاڵۆژنیان بوو.

*گوندی (مەلا زیاد) گوندێکە لە دەم زێی بچووك نزیك لە تەقتەق بە موڵك و تاپۆ هی بنەماڵەی خادم سوجادەیە، بەڵام لەلایەن خەڵکی (مەلا زیاد)ەوە دەستبەسەرداگیراوە، بنەماڵەی خادم سوجادە کەسی واشیان نەماوە خاوەنداریەتی بکات.

ئاوەدانکردنەوەی گوندی (مەلازیاد)ی کە تاپۆی بنەماڵەی خادم سوجادەیە چەند بۆچوون هەیە کە مام حەمەد سلێمان لە گەرمك ساتووقەڵا ئاوەدانی کردۆتەوە چونکە عەزیزاغای سالحاغای لە گوندی (کانی ڕەش)بوو، دەیویست داگیری بکا لە دەست بنەماڵەی خادم سوجادە دەربهێنن ئەوانیش یەك ویەکگرتووبوون توانیان بەربەرەکانی ئاغا بکەن و بیپارێزن هەقی زەوییەکان بدەن بە بنەماڵەی خادم سوجادە!!

بۆچوونێکی دیکەش هەیە کە ساڵی ١٩٤٥ پێنج کەسایەتی خەڵکی گوندی گەرمك ساتوقەڵا ئاوەدانی دەکەنەوە چونکە مەلا زیاد گوندێکی دەم زێ و بەئاو وبەراو خاکی بەپیت و ڕەندبوو! هەندێ جوتیاری بێ کەس و داماوی لێ بوو لەلایەن عەزیزاغای سالحاغای غەفووری دەرکراون هەرەشە و تەقەیان لێکراوە گوندی مەلازیاد چۆڵکردووە، جوتیارەکانیش ئەمانە بوون (مام عەوڵا شێخەی کانی ڕەش کە بەرەسەن خەڵکی گوندی شیوەجان)بووە ناسراو بە کوێخا عەوڵا شێخە ئەو ماڵانەی لەگەڵ بووە حەمەڕەش عەباس، سلێمان خدرە سوور، عەبدول جوتیار، حەمەعەلی خەجێ، دەرکراون و ماڵ و هەواریان سووتاندوون. لەگەڵ مام عەباس و حەمەڕەش کە خەڵکی گوندی (شانشین)بووین لە ناوچەی پردێ، دوایی ئاغادەریکردوون و گوندی مەلازیادیان چۆڵکردووە چونکە گوندەکەیان سوتاندووە! ئەو پێنج کەسایەتی یە ئەمانە بوون، کە بەربەرەکانی ئاغایان کردووە و بەرگریان لە زەوی و بەراوی بنەماڵەی خادم سوجادە کردووە:

١-حاجی عەلی ئەمین سلێمان

٢-کوێخا حەمەخان ساڵح سلێمان

٣-خورشید رشید حەمەد سلێمان

٤-حەمەدەمین کەریم ئۆمەرخەمان

٥-عەولا حەمەد سلێمان

لەسەرچاوەیەکی دیکە دەڵێن بایز ڕەشید حەمەد سلێمانیشیان لەگەڵ بووە، شەڕە تفەنگیان لەگەڵ عەزیزاغای ساڵحاغا کردووە، چوونەتە سەری شتوومەکی ماڵەوەیان هێناوە، دوایی عەزیزاغای سالحاغا وازی هێناوە گوتویەتی نەمن دەنگ و نە ئەنگۆ دەنگ، مەلا زیاد یان پاراستووە سالانە هەق و زەکاتیان دەدا بە بنەماڵەی خادم سوجادە شیعرەکەی (دڵدار)بە ناوونیشانی (لالەباس)ساڵی ١٩٤٥ دەبێت لەو ناوچەیە بووبێت چونکە (زەوی زێرین دۆڵ) لە چیای گەرمگ!!

(لالەباس)

ڕۆژێکی پایز لە پێش نیوەڕۆ
لالەباسم دیت زەوی ئەدا تۆ
ڕووت وزگ والا پیر وتێکشکاو
پشتی چەماوە لووت لەسەر ئەژنۆ
گۆچانی دەسی دەستەندووی جووت بوو
دەنگی نووسابوو بە هێ هێ و هۆهۆ
هەی ماندونەبی لالۆی جووتیارە
ووتی هەربژی ڕۆڵەی لەسەرخۆ
ووتم کاری جووت، ڕەنجی لاوێنی
زۆر دوورن لەگەڵ پیرێکی وەك تۆ
ڕەسوولەی کوڕت ڕەنجبەری چاکە
زەلامی ملهوڕ، لاوی جوست و جۆ
کوا بۆچی جووتت لەباتی ناکا

بۆچی تۆ نادا، بۆچی نابێ شۆ

هێندێ پێ کەنی، سەیرێکی کردم

دەستی خستەسەر، ڕیشی وەك پەمۆ

ئاگری دڵی لە هەردوو چاوی

بڵێسەی ئەدا وەك جووتێ پشکۆ

ووتی لە هاوین کێخوا (کاکە سوور)

هاتەماڵەوە پێی ووتم لالۆ

شایەدی بدە زەوی (زێڕین دۆڵ)

کەوا هین منە قورئانیش بخۆ

ووتم کاکە سوور، بەم سەرو ڕیشە

ئۆباڵی خەڵقی ناخەمە ئەستۆ

ووتی هەروەها بەسەری ئاغا

ئەتکەمە پۆڕی بەر چەنگی هەڵۆ

بۆشەو زەلامی هەناردە سەرم

ماڵیان دامە بەر شیلینگی بڕنۆ

سێ مانگام هەبوو بە تاڵانی برد

منالی هێشتم، بەبێ ماست و دۆ

هەندەی پێ نەچوو، عەزەی ساڵح ئاغا

لەسەری کردم بۆ حیسەی تاپۆ

چوومە (خراپە)ووتم ئاغا گیان

ملکم هین خۆمە قەیدن لە تاپۆ

پێی ووتم (پیرەی سمێڵ کلکە سە)

یا تاپۆ بدە، یا بارکە بڕۆ

دووسێ ڕەش و ڕووت وڵاغیان هێنا

**دەغڵیان بارکرد بەلێ لێ و لۆلۆ**

**کێخوای چەمبەڕیش، ڕەسوولەی پەت کرد**

**کردی بە عەسکەر، بردی لە بۆ کۆ**

**لە کۆیە چوومە لای زابت ووتم**

**ئەفەندی عومرم گەییە حەفتاو نۆ**

**بێجگە لەم کوڕە ووجاغم کوێرە**

**بەمنی ببەخشە مەمکە ڕەنجەڕۆ**

**زابت تووڕە بوو هەڵسایە سەر پێ**

**فڕێی دامەدەر، بە پاڵەپەستۆ**

**پێم ووت (لالەباس)پارەت بدایە**

**ڕەسوول معیل بوو بەبێ گفتوگۆ**

**ووتی پارەو من هەی خاکم وەسەر**

**بریا ئەمزانی ئەی خودایە بۆ**

**ئەوا چل ساڵە زەوی ئەکێڵم**

**فەللاحی ئەکەم هەتاکو ئیمڕۆ**

**نرخی عارەەی ڕوونی ماندووییم**

**تیکە نانێکە، چەنان؟نانەجۆ**

**ئەویش بەبێ دۆ...**

**ئەویش بەبێ دۆ...**

لەسەر ئەم پارچە هەڵبەستە ژیانی دڵدار دەکەوێتە مەترسییەوە، بەڵام پیاوێکی دەسەڵاتداری ئەوسا بەکەین و بەینەکە دەزانێ و لێ ناگەڕێ تاوان ڕوو بدات، دەبێت عەزیزی ئاغای سالحاغا(١٩١٩ کۆیە-١٩٨٨کۆیە گۆڕستانی کەکۆن)، هەڕەشەی لێکردبێ، لەسەر ئەو شیعرە، کاکە زیادی حەماغای گەورە بەرگری لە دڵدار کردووە، نەیهێڵاوە ئازاری بدەن یان بکوژن.

دڵدار شیعری لالەباسی لە ١٩٤٥ نووسوە، کە باسی ڕوداوێك و مەغدوریەکی جوتیارێکی کورد دەکا، لەو شیعرەدا وەك پارێزەرێك بەرگری دەکا، لەسەر ئەو شیعرە هەڕەشەی کوشتنی لێکرا، چونکە بەناو باسییان دەکا[1].

کێخوا کاکە سوور مەبەستی (شەمس قادر غەفوریە) ناسراوە بە (مەلا سوورە)، ساڵی ١٩٠٥ خراپە -١٩٨١ کۆیە گۆڕستانی کەکۆن.

سەرباری بەرگریکردنی کاکە زیاد لە دڵدار لەمەڕ شیعرێکی، کە باسی زوڵمی ئاغایەکی کۆیە دەکا، بەشێوەیەك هەڕەشەی لێکراوە، بەڵام کاکە زیاد نەیهێشت هیچ زیانێکی پێ بگا، کەچی لە ڕووی بیرو بۆچوونەوە لەیەك دووربوون وەك فاتح رەسول دەبێژێ[2].

زەوی (زێڕین دۆڵ) لە دەشتی کۆیە سێ شوێن هەیە بەو ناوەوە، یەکیان کەوتۆتە ئاقاری گوندی (قوڵقوڵە)، ئەوی دیکەیان کەوتۆتە سنووری (گوندی گەرمك)، یەکی دیکەش هەیە لە (ساتوقەڵا) هەر بەناوی (زێڕین دۆڵ). پێدەچێت ئەو لالەباسە پردەیی بووبێ یان هی سێگردکان و کانی لەلەو ئۆمەر گومبەت چونکە ئەوان (لالە) بەکار دەهێنن دایکی دڵداریش خزمی ئەوانە، لالەباس پێ دەچێت لە مەلازیاد بووبێت، زێڕین دۆڵیش هەر مەبەستی گوندی گەرمك بووبێت کە نزیکە لە مەلا زیاد، عەزیزاغای ساڵحاغاش لە گوندی کانی ڕەش و خراپە ژیاوە، بەڵام بنکەی سەرەکی قەڵا و کۆشکی لە خراپە بووە، هەم گوندی قوڵقوڵە هەم مەلا زیاد ساتوقەڵا لێك نزیکن.

دەبێت پێش ساڵی ١٩٤٥ مەلازیاد ئاوەدان بووبێت بە گوێرەی یاداشتی دڵدار لە ساڵی ١٩٣٥ باسی مەلا زیاد دەکا بەو شێوەیە:

لە کۆیە زۆر گیرنەبووم چوومە (مەلا زیاد) بۆ سەر توتنجار عوسمان ئەفەندی ناوێك کە لە تورکیاوە بە خەبیری زراعی لەلایەن حکومەت جەلب کرابوو، لەپاشان ئیستیغنای لێ کرابوو ئەم عوسمان ئەفەندی یە، لەسەر ئەساسی ئەمەی کەتوتنی سەیناغ تووتن بەبێ ئاو پەروەردەکردن دەکات هاتبووە مەلا زیاد لە ئەرزێك توتنی داچاندبوو کە دەم زێ وئاوەزەن بوو، عوسمان

[1] پێشڕەوی سەید برایمی: (دڵدارژیانی سیاسی)، (کۆیە، چاپخانەی سۆفیا، ٢٠٢٣)، ل٣٤٤
٢پێشڕەوی سەید برایمی: هەمان سەرچاوە، ل٣٤٠.

ئەفەندی کوردی نەدەزانی لەگەڵ مەلا زیادییەکان هەر بە ئیشارەت قسەی دەکرد، بەشەو غرامەفۆنی لێ ئەداو کرمانج گەل لە دەوری کۆئەبوونەوە، بە ڕۆژیش ئیشی دەکرد بەم سوورەتە عوسمان ئەفەندی دەم و سات مەشغوول بوو بەڵام عەسران ئەهاتە لای من قاوەی ئەخواردەوە و باسی خۆش خۆشمان بەدەم یاری (دۆمینەوە)لەگەڵ یەکتر ئەکرد، حەقیقەت من لە منداڵییەوە هەندێك تورکیم ئەزانی وە لە گەورەیشدا بە موتالەعە ئیتلاعێکی زۆرم لە تورکی پەیداکرد، ئەم جارە بەهۆی عوسمان ئەفدی تەمرنییکی باشم لەسەر بە تورکی دواندن کرد لەگەڵ ئەوا بەچاکی لەهجەم ئیستیقامەتی سەند وەختی تورکی لاتینی لە ئەوەوە فێربووم، عوسمان ئەفەندی پیاوێکی کورتە باڵای قەڵەوی دەم و چاو خڕوکای دەم بە پێکەنین بوو[1].

گەرمك و مەلازیادییەکان یەك خووی زۆر خراپیان هەیە وەك کورد واز لە خووی شەڕ و ناکۆکی ناوخۆیان ناهێنن، هەموو یەك پشت و بەرەبابن دژمنایەتی یەکتر دەکەن و یەکتریان کوشتووە خۆبەخۆ بەگژیەکدا دەچن! بەدرێژایی ئەو ماوەیە لەشەڕ هەرا و یەکتر کوشتنی ناوخۆ ئەو چوار بەرەبابە گوندیان چۆڵکردووە!

-بەرەبابی حاجی حسێن قادر سلیمان لە گەرمك کەوتونەتە (خدران).

-بەرەبای حەمەدەمین کەریم گۆج لە مەلازیادەوە چوونەتە خدران.

-بەرەبابی قادری ئۆمەر وەلك لە گەرمك چوونەتە شیلەخان و مووغاغ لەوێوە حاسل و ئالان و دوای کەوتونەتە سلێمانی.

-بەرەبابی سلێمان عەلك لەمەلازیادەوە کەوتوونەتە (عەربەت).

هەمووی بەهۆی دژمنایەتی یەوە بووە ئەو کۆچ و بەجێ هێشتنە!! زۆربەشیان ئامۆزابووین.

ئەو زانیارییانەم لە عەزیز بایز و خالیدی حاجی عەلی و ڕەشید حاجی کاوەیسی کە خەڵکی مەلازیادن وەرگرتووە. لەگەڵ مامۆستا عەبدول ڕەزاق حاجی عەباس ساتوقەڵایی و محەمەد ساتوقەڵایی وەرگرتوە لەگەڵ مەلا عوزێر قوڵقوڵەیی و مەحمودی مەلا سوورە.

---

١عبدالخالق علاءالدین: (دڵدار شاعیری شۆڕشگێڕی کورد)، (هەولێر. بڵاوکراوەی دار افاق عربیە، ١٩٨٣)، ل٥٦.

*مامۆستا عەبدول خالق عەلائەددین لە کتێبی (کۆمەڵێك هۆنراوە و فۆلکلۆری کوردی) دەنووسێ و دەڵێ:

ساڵی (٢٠٠٨) کە لە لەندەن گەڕامەوە مام جەلال بە دکتۆر فوئاد مەعسومی گوتبوو، کە دەیەوێ من ببینێ، منیش لە قەڵاچوالان سەرم لێ دا، کە چووم خەڵکێکی زۆر چاوەڕوانییان دەکرد، یەکسەر چوومە ژوورێ، دیوانی دڵدارم بە دیاری پێشکەش کرد، باسی کۆیە هاتە گۆڕێ، یەکسەر باسی زەینەب خانی کرد گوتی: (وەختی خۆی لە ماڵی وان بووین، ئەو ژنە زۆر خزمەتی ئێمەی کردووە، بەس بەداخەوە ناوی بزرە و چەندان جار تیکراری کردەوە کە پێویستە جەنازەی بێتەوە شاری کۆیە، ئەوە ئێستە جەنازەی دڵدار هاتووەتەوە، شوێنێکمان بۆ دروست کردووە، هەوڵ دەدەین قەناعەت بە خانەوادەکەیان بکەین ئەویش جەنازەی بێتەوە شاری کۆیە، چونکە ئەوانە سەروەتی شاری کۆیەن.

بۆ مێژوو با ئەوە لەبیر نەکرێ زەینەب خان ببووە هەوێنی کرانەوەی مێشك پێشکەوتنخوازی لە نێو خەڵکی کۆیە، ئەو سەردەمە ئافرەت لە کونجی ماڵەوە لە گۆشەگیر بوو، ڕووی لە مەدرەسە نەدەکرد خوێندەوارییەکەی ئەوتۆیان نەبوو کەچی دیتیان کە ژنێکی زیرەك و بیرتیژ و بە ئیمکانیاتی زانستیی و عیلمیی خۆیەوە هاتە مەیدانەوە، ئەو کە دادەنیشت هەمووم سەریان لێی سوڕدەما موعجەبی دەبوون، دەتوانم بڵێم لە ناو ئافرەتانی کۆیە شۆڕشێکی بەرپاکردبوو، گەلێك کەس چاویان لەوەکرد، مێشك و عەقلییەتی ئەو ببووە نموونە نەك لە عائیلە و چوار دەوری خۆی، بەڵکو بۆ شاری کۆیە، دیاریشە خەڵکی کۆیە عاشقی خوێندەواری و پاپەندی تەقالیدبوون، درەنگ کچیان ناردۆتە مەکتەب.

مامۆستا مەجیدی مەلا ڕەئووفی خادم سوجادە کە برا بچووکی زەینەب خان و دڵداری شاعیر بوو، ڕۆشنبیرێکی گەورە بوو، کەسێکی چەپ بوو، هاوڕێیەتیمان لەگەڵ یەکتر زۆر نزیك بوو، هامووشۆمان هەبوو، وەکو باسمان کرد ئەو پێوەندییە دەگەڕایەوە بۆ پێوەندی هەردوو لامان و هاوڕێیەتی باوکم لەگەڵ سەعدی و ئاسەف و دڵدار، دواتر من لەگەڵ مەجیدی برا بچووکیان).

*بنەماڵەی خادم سوجادە خانەوادەیەکی مالیکە بوون، لە ڕاستیدا لە رووی

جلوبەرگی و پۆشاکەوە وەك ئەورووپیەکان جلی دەپۆشی لەو سەردەمەدا ئەمە نیشانەی ئەوپەڕی مەدەنیەت بوو، تەرزی جلوبەرگ و شێوەی هەمان شێوەی بنەماڵەی مالیکی عێراق بوو مەبەستم وەك ئافرەتەکانی دەربارەی مەلیکی عێراق جلوبەرگی دەپۆشا، ئەو بنەماڵەیە پێشتر لە بەغدا و ئیستەمبوڵ ئاگاداری مۆدە و جلوبەرگی ئەورووپی بووین. لە کتێبی (زەینەب خان و چەند بیرەوەرییەك)-عوسمان ڕەشاد موفتی.

*مەلا ڕەئووفەفەندی خۆی و سێ کوڕی دەرچووی کۆلێژی ماف بووین-(سەعدی، ئاسەف، دڵدار)

*سەعیداغا تیمار کەوا داخوازی زەینەب خانی کردووە، مەلا ڕەئووفەفەندی خادم سوجادە گووتوویەتی:

(ئەمن بەو زەواجە ڕازیم، بەس دوو مەرجم هەیە:

یەکەمیان زەینەبی کچم ڕۆشەنبیرە و شیعر دەنوسێ و حەزی لە کاری ڕۆشەنبیری و سەردەمی لەگەڵ فکری نەتەوەیی هەیە ڕێی لەو ئارەزووی نەگرن، دووەمیان ئەو گیژەی من ئەو کوڕەی نەدیوە ناکرێ ڕای کچەکەم بە هەند وەرنەگیرێ چونکە بەیەکەوە ژیان بەسەردەبەن! ڕای زەینەب خان وەرگیراوە ئەوجا شووی پێکردووە، دەبێ لە ساڵی ١٩٢٣ زەینەب خان گواسترابێتەوە بۆ سەعیداغای تیمار)لە کتێبی (زەینەب خان و چەند بیرەوەرییەك)-عوسمان ڕەشاد موفتی.

زەینەب خان بەڕاستی ئافرەتێکی مەرد و رابەر بووە تاکە ئافرەتیش بووە لە دیوەخانەکانی خۆیان لە مەجلیسی پیاوان دانیشتووە هەموو جۆرە موناقەشەیەکی کردووە و دواتر لە ماڵی خۆیان کچانی کۆیەی ئەو سەردەمەی فێرە خوێندەواری و زانستی ئاینی و ڕۆشنبیری کردووە و دەستڕەنگین بووە لە درووستکردنی شیرەمەنی و خواردن و ڕستن و چنین و وێنە درووستکردن، تفەنگچی و ئەسپسوارێکی کەم وێنە بووە لەسەر دەستی باوکی بۆتە یەکەمین ئافرەتی شەترەنجزان و زۆر جار شەترەنجی لە باوکی و ئاسەفی برا بچووکی بردۆتەوە، چونکە لەو سەردەمەی کۆمەڵگای کوردی کەم ئافرەتی لەو شێوە هەڵکەوتووە.

*دڵدار بە یەکەم شاعیری کورد دادەندرێت کە بوێرانە و ئازایانە جۆرە شیعرێکی داناوە کە دەکرێت پێی بگوترێت شیعری ڕەخنەی ئاینی لە ئەدەبی کوردیدا کە پێشتر ئەو جۆرە شیعرە لە ئەدەبیاتی کوردیدا باو نەبووە[1].

دڵدار نەك هەر لە داهێنانی شیعری نەتەوەیی خاوەن هزرێکی ناسیۆنالیستی بووە، بەڵکو لە بواری فەلەسەفەی ژیان و مرۆڤدۆستی و ڕەخنەی ئاینیش پێشەنگ و سەرامەند بووە[2].

خوێندنەوەیەکی شیکاری بۆ هزری نەتەوەیی لە ژیان و بەرهەمەکانی دڵدار دا لە نووسینی د.سالار عەزیز مەحمەد

*دڵدار(١٩١٨-١٩٤٨) لە یاداشتەکانی نوسیوویەتی:

بەڵام زروفی ئەوساکە عائیلەوی مامۆستای هەرە گەورەم بووە و سوڵتەی دایکم و خوشکی لەخۆ گەورەترم مورشیدم بوون. (مەبەستی زەهوەخانی دایکی و زەینەب خانی خوشکێتی) دڵداریش باسی باوکی نەکردووە کە عەبدوڵلافەندی برای زەهوە خان کە دەکاتە خاڵی کە کوژراوە، نووسیوویەتی: عەبدوڵلافەندی خاڵم لەلایەن عوسمان پەروەرەکانەوە تەحریزکراوە و باوکیشم زاتەن یەك لەو عوسمان پەروەرانە بوو! دوایی نوسیویەتی:

ئەمما دایکم ئافرەتێکی دیدە بوو خاوەنی عیزەتی نەفسێکی زۆر بەرز بوو، هەرگیز ماڵی ئێمەی لە خزمەتکار و خزمەتچی ئافرەت خاڵی نەکردووە لە بەر ئەوە من کە منداڵێك بووم خۆم لە ناو مەزاهیری زادەگانیدا دیتووە، ئەما لەبەر ئەوەی کە دایکم ئەوساکە تازە برای ئیعدام کرابوو لە پاشان لە وەختێکی زۆر دەستکورت و فەقیری بوو هەردەم چاو لە گریان و لە ڕووخۆشی دوور بوو منیش لە ناو موحیتێکی غەم و ئەندۆ پەروەردە دەکرام شێوەییێکی (کەئابەت) و ماتییێکی تەبیعیم وەرگرت کە دایکم ئەگریا زۆری پێ تێك ئەچووم.

---

[1] دڵدار شاعیری ڕەسەنایەتی زمان و شیعری هزری نەتەوەیی- باسەکانی سێیەمین کۆنفرانسی ناودارانی کۆیە- یادی سەدساڵەی لەدایکبوونی دڵدار، - ١٩١٨- ٢٠١٨

خوێندنەوەی شیکاری بۆ هزری نەتەوەی لەژیان و بەرهەمەکانی دڵدار دا، لە نووسینی: د.سالار عەزیز مەحمود، ل٣٦٤

٢ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٦٤.

ئەنجام دڵدار کەسایەتی پێکهاتەیەکی ئاڵۆز و شاراوەیە، لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام لە پێشکەوتن و گەشە و گۆڕاندایە جا بەهەر ئاڕاستە و بوارێکدا بێت (ئەرێنی، نەرێنی، بەهێز، لاواز،...هتد)[1].

دڵداری شاعیر بە گوزارشتکردن لە بارودۆخی هەست و خەم و پەژارەکانی وێنەی دەروونی کێشاون[2].

لە هێڵی گشتی شیعرەکانی دڵدار دا دەخوێندرێتەوە ئەوەیە کە دڵدار کەسێکی میسالی بووە هەم لە هزر و هەمیش لە کۆی ژیانیدا بۆیە ژیانی بۆ دەرەوەی خۆی تەرخانکردووە، بەمەش تەنیا لە چەند شیعرێکی وەك: خەندەکی بایی و گوڵی سور و شیعرە هاوبەشەکانی لەگەڵ (عەونی و جاهد) مافی بە هەستەکانی داوە جوانییە تایبەتەکەی هەناسە بدەن.

جوانی وتێگەیشتنی جوانی لای دڵدار ناوەڕۆك بووە نەك ڕوخسار، جەوهەری جوانی و هەڵوێست نواندن وکردار و خزمەتکردندا بەدیکردووە و خەمی گەورەی نشتیمان و هەر نشتیمان بووە کە بۆتە ئیلهامبەخشی گوتارەکانی نێو دەقە نەتەوەییەکانی.

دڵدار لە نێوان دووانەی عیشق و وڵاتدا دووەمییان هەڵدەبژێرێت، وەك چۆن لە نێوان حاجی و نالی و ئاوەز و هەستەکانی دەکەونە ململانێ و لە نێوان جوانییە قووڵە غەزەلییەکانی نالی و هەستی پاکی نشتیمانپەروەری حاجی ئارەزووی بەلای حاجی سەردەکەوێت.

دڵدار ڕەخنەگرێکی هۆشیاری نەك تەنیا سەردەمی خۆی بەڵکو بۆ دواتریش بووە و (من)ەکانی دڵدار سنووری (من)ی خودیان تێپەڕاندووە و لەنێو (من)ی نەتەوەیی تواونەتەوە[3].

---

[1] دڵدار شاعیری ڕەسەنایەتی زمان و شیعری هزری نەتەوەیی- باسەکانی سێیەمین کۆنفرانسی ناودارانی کۆیە- یادی سەدساڵەی لەدایکبوونی دڵدار، - ١٩١٨- ٢٠١٨

کەسایەتی و بژاردەی کەسییەتی لەدیدەی دڵدارەوە، لێکۆڵینەوەیەکی دەروونناسی کۆمەڵایەتی شیکاری ڕەخنەییە، لە نووسینی: م.ی.ڕێزان عوسمان مستەفا، ل٣٦٤

[2] هەمان سەرچاوە، بنەماکانی شیعریەت لە زمانی شیعری (دڵدار)دا، لە نووسینی: پ.ی.د. صافیە محەمەد ئەحمەد و م.ی. هێرۆ عەبدول ڕەحمان مستەفا، ل٣٨٥.

[3] دڵدار شاعیری ڕەسەنایەتی زمان و شیعری هزری نەتەوەیی- باسەکانی سێیەمین کۆنفرانسی ناودارانی کۆیە- یادی سەدساڵەی لەدایکبوونی دڵدار، - ١٩١٨- ٢٠١٨

دڵدار یەکێکە لە شاعیرە نوێخواز و نەتەوەپەروەرەکان، کە هەموو هیوا و ئامانجی پێشکەوتن و سەرکەوتنی نەتەوەکەی بووە، سەرکەوتن بەسەر نەزانین و نەخوێندەواری، سەرکەوتن بەسەر دوژمنانی کورد کە بەدرێژایی مێژوو خوێنمان دەمژن، تاڵانمان دەکەن، مارشی (ئەی ڕەقیب)تاکە سروودی نەتەوەییە تا ئێستاکە هەموو کورد لەسەری کۆکن و هەموو کورد کۆدەکاتەوە، ئەو سروودانەش کە بۆ قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی خوێندن دایناون، ڕۆڵی کاریگەریان هەبووە لە پەروەردەکردنی منداڵانی کورد بە ڕەوشت و خووی چاك و دڵسۆزی گەل و خاك، دڵدار هونەری شیعر و بنەماکانی شیعری لە شیعر و سرووده نەتەوەییەکان کردۆتە قوربانی گەیاندنی پەیامی نەتەوەیی، ئەوەش نیشانەی دڵسۆزی و پاکی بووە بۆ نیشتمان و گەلەکەی[1].

*بنەماڵەی خادم سوجادە گەورەترین کتێبخانەیان هەبووە لە کۆیە، کتاب و دەستنووسەکانی ماون و پارێزراون لەلای مامۆستا عەبدولڕەحمان بێلاف!

*گومان هەیە دڵدار و ئاسەف کوڕانی مەلا ڕەئوفەفەندی ژەهر خوارد کرابن، چونکە زوو جوانەمەرگ بوون بەتەم و مزاوی، لەبەر ئەوەی سیاسەتمەدار و نیشتمانی و حزبی بووین، ڕایەك هەیە کوشتبیانن، ئاسەف ١٩٤٨/١٠/٢٢ کۆچی دوایی کردووە، دڵداریش لە ١٩٤٨/١١/١٢، ٢٠ ڕۆژ نێوانیان بووە، ئاماژە بەوە دەکرێت مەلا سەعدی باپیرە گەورەیان ١١١ ساڵ ژیا بێت[2].

---

بەهای جوانیناسی لە شیعرەکانی دڵدار دا، لە نووسینی: پ.ی.د. پەخشان سابیر حەمەد، ل٤٠٩.

١ هەمان سەرەچاوە، ڕەنگدانەوەی بیری ناسیۆنالیستی و نەتەوەیی پێشکەوتنخواز لە سروودەکانی دڵداردا، لە نووسینی: د.عەبدولواحید ئیدریس شەریف، ل٥١٠.

٢ گۆڤاری دیوان-ژمارە ١٦ -ئەیلولی ساڵی٢٠٢٢ ل٥٠ عەبدولڕەحمان بێلاف: (هەرچی کەلەپەلی دڵدار هەیە لەلایەن زەینەب خانی خوشکییەوە پارێزراوە، تا ئێستاش وەکو خۆی ماوە) لە وەڵامی پرسیارێك نووسراوە:

(هەر وەکو خانەوادەکەیان باسیان کردووە بە تایبەتی مامۆستا حیکمەت و کاك ڕەمزی، کە ئەوانیش لە سەرووی خۆیانە بیستووە، کە دڵدار و ئاسەف دەبێت ژەهرخواردوو کرابن، چونکە ناوبانگی چالاکییەکانیان گەیشتبووە بەغدا و وڵاتانی دراوسێ.

+ هەمان سەرچاوەی پێشوو -ل٥١ و ٥٢ لە چاوپێکەوتنی ئەمەل سەعدی خادم سوجادە بە ناونیشانی (دڵدار کەسێك بووە، شانازی بنەماڵەکەیەوە کردووە، بەڵام هەرگیز نەی دەدرکاند لە بنەماڵەی خادم سەجادەیە) لە وەڵامی پرسیارێك دا:

--ئەگەر بیرت بێت دڵدار هیچ نەخۆشییەکی هەبوو؟

+نەخێر هیچ نەخۆشییەکی نەبووە، وەکو لە پوورم زەینەب خان و باوکم سەعدی و دایکم و مامم مەجیدم بیستووە، دڵدار ژەهرخواردوو کراوە، لە نێوان بیست ڕۆژدا هەردوو برا ئاسەف و دڵدار مردن و جوانەمەرگ بوون

حکومەت لە ڕێگەی فەرمانبەرەکانی خۆیەوە پڕوپاگەندەی بڵاوکردەوە، کە گوایە دڵدار تەسەمومی کردووە، جگە لەوەش تاکو سووکایەتی پێ بکەن، گووتیان سەرخۆش بووە و بە ئارەق مردووە، کەچی لە ژیانیدا مەشروب خۆر نەبووە .

دڵـدار کـە ڕامیاریـزان و کوردایەتـی کـردووە تێکۆشـەرێکی دیـاری نـاو خەڵـك و ڕۆشـەنبیران بـووە، لـە ڕێکخـراوی دارکـەران بـووە، بـەو هۆیـەوە لەژێـر چاودێـری پۆلیـس و میریـی بـووە. بـۆ ڕاسـتی (هـەر ئـەو کاتـە ئەوانـە لەلایـەن پۆلیسـەوە چاودێـری کـراون، چونکـە چالاکـی کوردانـەی نـاو قوتابخانـە و دانیشـتنەکانیان، هەروەهـا هەڵوێسـتیان، تـا ڕادەیـەك ئاشـکرا بـوو، بۆیـە دەکـرێ بڵێیـن ئـەو ڕاپۆرتـەی پۆلیسـی هەولێـر کـە لـە بەڵگەنامەکـەی وەزارەتـی ناخـۆدا هاتـووە، سـەبارەت بـە ڕێکخـراوی دارکـەر)[1].

*لـە کتێبی(دڵـدار بیرمەنـد و شـاعیری شۆڕشـکێری کـورد) مامۆسـتا عەبدولخالـق عەلائەددیـن[2] ئامـادەی کـردووە لـە ل.٤٤، دڵـدار لـە موزەکەراتـی

---

کاتێك زەینەب خان، لە نەخۆشی لە بەغدایێ دەهاتەوە، لەگەڵ مامەکانم باسی ئەوەی دەکرد و بەردەوام ئەو پرسیارەی دەوروژاند مادام تەسەمومی کردووە، لەبەرچی کەس لە نادی مووەزەفین هیچی لێ نەهات، تەنیا ئەو تەسەمومی کرد

[1] پێشڕەوی سەید برایمی: (دڵدارژیانی سیاسی)، (کۆیە، چاپخانەی سۆفیا، ٢٠٢٣)، ل١٦٧-١٦٨

[2] عەبدول خالق عەلائەدین کوڕی حاجی ئاغای مستەفایە لە شاری کۆیە لە ساڵی (١٩٢٢) چاوی بە ژیان هەڵێناوە، دایکی عائیشە کچی میر عەلی بەگ کۆسەیە کەسایەتیەکی دەسەڵاتدار و نیشتەجێی گوندی سیساوەی سەر بە شەقڵاوە بووە. دوای تەواوکردنی خوێندنی سەرەتایی لە کۆیە دەچێتە خانەی مامۆستایان بەناوی (دار المعلمین الریفیە). کە بۆ یەکەمجار بوو لە هەولێر و سلێمانی دەکرێتەوە، دەبێتە سەرۆکی یەکێتی قوتابیانی خوێندنگاکەی کە بەشداری لە کۆنگرەی یەکێتی قوتابیانی عێراق دەکا، کە بۆ یەکەمجار لە مێژووی عێراق لە بەغدا دەبەسترێ (١٩٤٨).

لە پایزی هەمان ساڵدا و لە ئاکامی ڕاگەیاندنی (حوکمی عورفی)بەهۆی خەبات و جموجۆڵی سیاسی دەستگیر دەکرێ دوای بەسەر بردنی ماوەی شەش مانگ لە بەندیخانەکانی کۆیە و هەولێر و کەرکووك و بەغدا دوو ساڵ حوکم و ساڵێك لەژێر چاودێری پۆلیس لە مەحکمەی عورفی بەسەرۆکایەتی (عەقید عەبدوڵڵا نەعسان)بەسەری دەسەپێنرێ. بەڵام بەهۆی یاسای تەمەن حوکمەکەی ئەنجام نادرێ ئیتر دوای تەواوکردنی خوێندنی خانەی مامۆستایان کە ماوەی پێنج ساڵ بوو لە قوتابخانەی گوندی (قورشاغڵو)لە دەشتی دزەییاتی لەپرۆسەی پەروەردە دەستبەکار دەبێ لە ساڵی (١٩٥٣) و لەساڵی (١٩٥٨) دەگوازرێتەوە بۆ قوتابخانەی سەرەتایی (ئولا) لە کۆیە، دوای دوو ساڵ دەگوازرێتەوە بۆ باشووری عێراق بۆ شارۆچکەی (قلعة سکر)سەر بە پارێزگای ناسریە، دوای دوو ساڵ فەرمان بەجێ دێنێ بۆ ماوەی ساڵێك و دوو مانگ بە بەشداربونێکی بیروباوەڕ بە شۆڕشی ئەیلول لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆرش بەژیانێکی سادە شێوەی پێشمەرگایەتی بەسەر دەبا ئیتر لە کەشوهەوایەکی ووتوویژ لەگەڵ حکومەتی عێراق دەگەڕێتەوە سەر فەرمان لە قوتابخانەی (شریف الرضیی)سەر بەشاری (سوق الشیوخ)هەمان پارێزگا.

دەبێتە ئەندامی سەندیکای مامۆستایان و بە نوێنەرایەتی مامۆستایانی کۆیە بەشداری لە یەکەم کۆنگرەی مامۆستایان لە بەغدا دەکا کە خودی عەبدولکەریم قاسم سەرکردەی شۆڕشی چواردەی تەمووز وتاری کردنەوەی کرنگرەکەی دا. بە نوێنەرایەتی شاندی لاوانی کۆیە بەشداری لە دوو ڤیستڤاڵی لاوانی جیهانی لە شاری (ڤیەننا)پایتەختی نەمسا (١٩٥٩)و (سۆفیا)پایتەختی دەوڵەتی بولغاریا(١٩٦٨).

لەسەرەتای دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی کورد دەبێتە ئەندام و بەشداری لەیەکەم کۆنگرە دەکا لە بەغدا (١٩٧١)و لە کۆنگرەکانی یەك لە دوای یەکدا دەکا و چەند جارێك دەبێتە ئەندامی دەستەی بەرێوەبەرایەتی هەولێر.

ئەندامی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانە، لە ساڵی ١٩٩٦ وەك ڕاوێژکار لە وەزارەتی ڕۆشنبیری هەرێمی کوردستان بەردەوام

نوسـیویەتی:

(موجادەلەیەکـی کاکـە ئاسـەف بـوو کـە لـە بابەتـی نیشـتمان پەروەریـەوە لەگەڵـی کـردم ئەویـش بـەم سـورەتە بـوو: پـاش نیـوەڕۆ بـوو کـە لـە هەیـوان دانیشـتبووین چایەمـان دەخـواردەوە کـە ئاسـەف لێـی پرسـیم: یونـس تـۆ چیـت؟ جوابم دایەوە (مـن یونسـم چ بم؟) ئینسـانم وتـی مـرازم ئەمە نییە یەعنـی تۆ خۆت بـە کـورد یـان تـورك یـان ئینگلیـز دائەنێیـت یـان نـا؟ پـاش گفتوگۆیەکـی زۆر کـە هیچـی لـێ تێنەگەیشـتم بـەڵام یـەك شـتی لـە عەقیـدە و ئیدیعـا گۆڕیـم کـە ئەویـش لێیـان پرسـیم تـۆ چیـت بڵێـم مـن کـوردم.دوو سـێ سـەعات لـە ژێـر تەئسـیری ئـەم وتارانـەدا مامـەوە).

*مـەلا رەئوفە فەنـدی خادم سوجادە هێنـدە ڕێـزی زەینـەب خانـی کچـی و زەهـوە خانـی خێزانـی گرتـووە گوتوویەتـی: زەینەبـی کچـم بـە هەمـوو کوڕەکانـم نـادەم هەمـوو کوڕەکانیشـم بـە ڕووحـی خـۆم نـادەم، خۆشـم ڕۆژێ هـەزار جـار بەقوربانـی زەهـوە خانمـی خێزانـم دەکـەم پێیـان گوتـووە مـادام (ئۆمـەری) واتـا لـە ژنەکـەت دەترسـێی!

*مەلاڕەئووفەفەنـدی خـادم سـوجادە لـە مـاوەی ژیانیـدا ئـەو وڵاتانـەی دیـوە (ئەسـتەنبوڵ، ئێـران، سـووریا، لوبنـان)، هەروەهـا لەگـەڵ حاجـی توفیـق و پیرەمێـرد و وەفایـی شـاعیر چوونەتـە وڵاتـی حیجـاز بـۆ زیارەتـی حـەج، لـەو سـەفەرەدا وەفایـی شـاعیر کۆچـی دوایـی کـردووە بەدەسـتی خۆیـان ناشـتوویانە.

*لـە ڕاسـتیدا مـەلا ڕەئـووف هـەر بـۆ خـۆی پێوەنـدی لەگـەڵ ماڵـە مەسـیحی و جولەکانـی شـاری کۆیـە زۆر خـۆش بـووە، زەینـەب خـان بەهـۆی ئـەو ماڵـە جـووەی لـە کۆیـە دراوسـێیان بـووە، فێـری زمانـی عیبـری بـووە.

*مەولـوود نامـەی پێغەمبـەر(د.خ)- زەینـەب خـان مـەلا ڕەئـووف خـادم سـوجادە (کچـە کـورد)-وەرگێـڕان لـە تورکییـەوە – شـێرزاد شـێخ محەمـەد- توێژینـەوە و پێداچوونـەوە- عەبدولڕحمـان مەعـروف- پێشـەکی –د. ئیبراهیـم ئەحمـەد شـوان

---

دەبێت، لەساڵی ١٩٩٨ دەچێتە شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیا و داوای مافی بەناهەندەیی دەکات.

لەساڵی ٢٠٠٥ بە پلەی ڕاوێژکار خانەنشین دەبێت.

لە ٢٠٠٢/١/٠١ کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی کەکۆن لە کۆیە بەخاك سپێردرا.

—هەولێر-٢٠٢١

*دەبێ ئیشارە بەوە بکەین زەینەب خان زۆر بە کەسایەتی باوکی کاریگەر بووە، دیاریشە باوکی مەلا و عەرەبیزانێکی زۆر باش بووە و شارەزایی تەواوی لە زمان و ئەدەبیاتی عەرەبی هەبووە و شیعری بە زمانی عەرەبی نوسیووە ماماۆستاکانیشی (**عەللامەی گەورە مەحموودەفەندی خادم سوجادەی باپیری**)

مەولوودنامەی پێغەمبەر(د.خ)- زەینەب خان مەلا رەئووف خادم سوجادە (کچە کورد)-وەرگێڕان لە تورکییەوە -شێرزاد شێخ محەمەد- توێژینەوە و پێداچوونەوە- عەبدولڕحمان مەعروف- پێشەکی - د.ئیبراهیم ئەحمەد شوان -هەولێر-٢٠٢١

*پەیوەندی نێوان باوکی و زەینەب خان و گرنگی پێدانی باوکی لە رووی رۆشنبیری و کوردپەروەرییە، نموونەی باوك بووە، ئەو ژنە سەرباری ئەوەی لە شیعرەکەیدا ئاماژەی بە گەورەیی و پلە و مەقامی باوکی کردووە بە مۆمی مەجلیسی کۆیەی داناوە! ئەو خۆیشی وا دیارە کەسایەتییەکەی ئاوەدان و مەجلیس گەرم و خاوەن دیوەخان بووە.

زەینەب خان - کچەکورد (١٩٠٠-١٩٦٣) خانمە شاعیری پێشەنگ لە خەبات و کۆڵنەداندا- پ.د.شوکرییە (شەکراو) رەسوول-٢٠١٨ نووسراوە:

(زەینەب خان — **کچەکورد**) یەکەم ژنە کوردە شیعری بۆ باوکی و دایکی و برا و برازاکانی واتا (**دڵدار و ئاسەفی برای و نەسرینی برازای**) وەك خێزان و بنەماڵە نوسیووە!

بەڵام لە راستیدا (حەزینە) بووە خێزانی مەلا عەبدوڵلای جەلیزادە.

زەینەب خان - (**کچەکورد**) لە ١٩٠٠/٣/٢١ لە گەڕەکی بەفری قەندی لە شاری کۆیە لە دایکبووە بەداخەوە لە رۆژی ١٩٦٣/١/١٨ بە هۆی نەخۆشی شێرپەنجە گیانی لە دەستدا و لە شاری هەولێر بە خاك سپێردراوە.

لە کتێبی (**زەینەب خان و چەند بیرەوەرییەک**) (**عوسمان رەشاد موفتی**) نووسیویەتی، پێداچوونەوە عەبدول خاڵق عەلائەددین لە ل١٢٣بە ناونیشانی (سەردانی بەڕێز مام جەلال تاڵەبانی بۆ ئارامگای زەینەب خانساڵی ١٩٩٢)

بە شایەدی خودی عوسمان ڕەشاد موفتی.

## مەلا سەعدی خادم سوجادە

زانایەکی مەزن بووە بۆیە حەزرەتی حاجی قادری کۆیی مەزەندە دەکرێت پێیدا هەڵگووتبێ، چونکە خادم سوجادە ئەو بەرەبابەن مەبەست لە سنجق شان واتای ئاڵای زانست و شکۆدار لەلایەکی دیکەوە سنجق بەمانای نێزە و ئاڵاش دێت ئەو زەمان ئاڵا لەسەری نێزەدا بڵند دەکرا، لەگەڵ ئەوەش سنجق لە دەوڵەتی عوسمانیدا یەکەیەکی کارگێڕی عوسمانی بووە بە عەرەبی پێی دەگوترا (لیوا)، حاکم پێشڕەوی سەید برایمیش پێی وایە لەو چوار خشتەکیەی حەزرەتی حاجی قادری کۆیی مەبەستی حاجی مەلا سەعدی خادم سوجادە بووبێ کە کەسایەتییەکی ئاینی بەناوبانگ و گەورەزانای سەردەمی خۆی بووە)[1] ئەو چوار خشتەکیەکەی جوان و نایاب و هاوشان و بەناوونیشانە:

ئەی عوتارید لە دەرت خادیمی سەججادە بە شان[2]

وە لە کۆیی فوسەحادا قەڵەمت سنجقەشان

(حاجی)قادر نییە بەیتێکی وەکوو ئێوە بڵێ،

ئەسپی کۆن زەحمەتە دەرچێ لەگەڵ ئاهوو ڕەوشان

محەمەد ڕەفیق کوڕی حاجی ئەمین کوڕی حاجی مەلا محەمەد کوڕی مەلا سەعدی (خادم السجاد)ەیە لە ((١٢٨٥ی کۆچی بەرامبەر بە ((١٨٦٦ی زاینی لە شارە خنجیلانەکەی کۆیە هاتوەتە دونیاوە، سەرەتای خوێندنی لە خزمەت باوکیا دەسپێدەکات، پاشان لە لای مامۆستا مەلا محەمەد ئەفەندی قوتب لە کەرکوك دەچێتە بەر خوێندن و تا کتێبی (مطول) لە خزمەتی ئەودا تەواودەکا، ئینجا دەچێتە لای مامۆستا و زانای بەرزی ئەو سەردەمە مامۆستا عەلی حیکمەت سیمەنسوری تا خوێندنی تەواودەکا و بەڵگەنامەی زانستی لا وەردەگرێت.

---

[1] پێشڕەوی سەید برایمی، پێداچوونەوە عەبدولکەریم شێخانی، (فەرهەنگی حاجی قادری کۆیی)، (کۆیە: چاپخانەی سۆفیا، ٢٠٢٢)، ل٣٠٤.

[2] سەردار حەمید میران و کەریم موستەفا شارەزا: (دیوانی حاجی قادری کۆیی)، (تاران، بڵاوکراوەی کوردستان، ١٣٩٠هەتاوی)، ل٢٥٢

ڕەفیق ئەفەندی سەرەڕای زمانی کوردی کە زمانی زگماکی خۆیەتی، زمانی تورکی و عەرەبی و فارسیش بە چاك و ڕەوانی زانیوە و شارەزایان بووە. نازانین چ ساڵێك و یا بە چ هۆیەکەوە هاتونەتە شاری کەرکوك و نیشتەجێبووە، بەڵام لە کەرکوکدا بە بنەماڵەیەکی خانەدان و ئایینپەروەر و زانستدۆست و ناودار ناسراون. لە ساڵی ١٩٢٤زاینی ڕەفیق ئەفەندی بە نێنەری کەرکوك لە پەرلەمانی پاشایەتی عێراق هەڵبژێردراوە تا نزیکەی ساڵی ١٩٢٨ زاینی نوێنەر بووە.

پیاوێکی قسەزان و بلیمەت و هەڵکەوتو و شۆڕەسواری مەیدانی ئەدەب بووە، یەکێکە لە ئەستێرە درەوشاوەکانی ئاسمانی ئەدەبی کلاسیکی نەتەوەی کورد، دەستێکی باڵای لە جوت وشە بەکارهێنان (جناس) هەبووە، زۆر بەجوانی لە قاوغێکی ڕەوانبێژی دایڕشتووە، هەروەکو لە زۆربەی هۆنراوەکانیدا دەردەکەوێت.

لە خوالێخۆشبو مامۆستا (عەلی ڕەفیق)م بیستووە کە کوڕی گەورەی ڕەفیق ئەفەندی بوو، وتی: (( من منداڵ بووم هەشت نۆ ساڵان دەبووم لەگەڵ کچێکی خزمی خۆمان ناوی ( کافیە ) بوو هاوتەمەن بووین، پێکەوە لەلای باوکم دەمانخوێند یەکترمان زۆر خۆشدەویست، وای لێهاتبو بێ یەکتر هەڵمان نەدەکرد، هەردوو خاوەنی دڵێکی بێگەرد و ئەویندار وەك کانیاوێکی خۆشەویستی بێ نیاز قوڵپی گرِی خۆشەویستی لێ هەڵدەقوڵا، بۆ ئەو خۆشەویستییەی نێوانمان وای کرد دوو دێر شیعری زۆر جوانی بەزمانی من و کافیەوە هەڵبەست و بۆی خوێندینەوە، کە تائێستا لە گوێمان دەزرنگێتەوە))، کە لەسەر زاری منەوە دەیوت:

بۆ دەوای دەردی دڵی من کافیە

پەرچەم و ڕوخساری ( خطی ) کافیە

بە زمانی کافیەوە ئەی وت

شێت و شەیدا بووم لە عالەم مونجەلی

سینە بوریان چاو بە گریان بۆ عەلی

لە سەردەمی عوسمانیەکاندا وشەی ( بۆدرۆ )یان بۆ لیستە موچە(معاش)

بەکارهێناوە، دەڵێن چەند جارێك موچەخۆرەکان لە سەری مانگدا بۆ مووچە وەرگرتن دەچن، کە ڕەفیق ئەفەندی یەکێك لەوانە بووە، ئەمینی سنوق دەیانگێریتەوە بە بیانوی ئەوە کە بۆدرۆ تەواو نەکراوە، درۆ ڕێکدەخا و بەهانە دێنێتەوە بۆیە ڕەفیق ئەفەندی ئەم بەیتە ناسکەی وتوە کە داخی دەرونی تیا دەردەبڕێ.

قەسدی تەئخیری مەعاشاتە درۆیە (بۆدرۆ) ئەجمەقەی سندوق ئەمینی موستەعیدە بۆ درۆ؟

وشەی (بۆدرۆ)ی یەکەم واتە لیستەی مووچە بەڵام (بۆدرۆ)ی دووەم واتای درۆکردن دەگرێتەوە.

هەروەکو وتمان ڕەفیق زۆر بایەخی بە ڕوخسار و تەکتیکی هۆنراوە داوە، سەرەڕای پتەوی و ڕەسەنی ناوەڕۆك و واتا، دەتوانین بڵێین لە ڕیزی ئەو شاعیر و هەڵکەوتوانەن کە لە لاپەڕە نەمرەکانی ئەدەبی کوردیدا جێی خۆیان کردۆتەوە، هەرچەندە نەیویستووە بە شاعیر ناوی دەربچێ، کەوا هەڵبەستەکانی بەڵگەی ئەم ڕاستییەن، بڕوانە ئەم چوارینە فارسییەی خوارەوە کە ساڵی (١٩٢٢ – ١٩٢٣) بۆ سەید مەحمود نەقیبی بەغدای نووسیوە، لە کاتێکدا کە میوانی بووە لە تەکیەی شێخ عەبدوالقادری گەیلانی ( خوا لێی ڕازی بێت ) لەگەڵ کۆمەڵێ هاورێ و دۆست و ئەدیب و ئەدەبدۆست و زانا و پیاوماقوڵ کۆدەبنەوە و باس باسی ڕاو و شکار و گەشت و گوزار دەبێ، جەنابی نەقیب کە لە ئارەزومەندانی ڕاوکردن دەبێ سەرەڕای ئەوەی کە تفاقی ڕاوکردنی دەبێت وەك مایین و تانجی و توڵە و تۆڕ و بازو .... هتد.

لەگەڵ ئەویشدا داوا لە ڕەفیق ئەفەندی دەکات بازێکی بۆ بنێرێ ڕاوی پێ بکات، ڕەفیق ئەفەندی هەر لەو شوێنەدا بەم چوارینە فارسییە وەڵامی دەداتەوە:

باز میلی بازنی بازاست باز ابن الباز را

ای مخنی ساز کن  این ماجرا بر ساز را

سیدی قلبی عالمی کردی به اخلاقی حسن

بهر سیدت كی بود حاجت به یوزو وازرا

بێ گومان هەستیار وەستایانە تەوریە و جناس زۆر بەجوانی بەكارهێناوە، وەك (باز)ی یەكەمجار بە مانای دووبارە بەكارهێناوە، (باز)ی دووەم واتای وازی (یاری) یە، بەڵام بازی سێهەم مەبەستی مەلی بازە و بازی چوارەم كە دەڵێ: ((باز ابن الباز)) ئاراستەی نەقیب بەكاریهێناوە وەك نیشانەیەك كە لە نەوەی جەنابی شێخ عەبدوالقادری گەیلانییە، چونكە پایەبەرز گەیلانی بەو نازناوە ناسراوە، وشەی (ساز)ی یەكەمجار مەبەستی ئامێری سازكردنە، واتا ڕێكخستنی ئاواز، دووەمجار مەبەستی ئامێری سازە كە یەكێك لە ئامێرە بە ناوبانگەكانی سازە و لە كوردەواریدا زۆر باوە لەگەڵ سەمتوردا بەكاردەهێندرێت، (سازوسەمتور) زۆر ناودەبرێ.

وشەی وازی بەكارهێناوە بەواتای تانجی یا تولە، (یوز)یش واتا تولە یا تانجی یا دوو جۆرە گیانلەبەرن وەك تولە و تانجی پێكەوە بۆ ڕاو بەكاردێت، واتای شیعرەكە بەم شێوەیە:

١.دوبارە ئارەزوی یاری بازی هەیە بازی كوری باز.

٢.ئەی گۆرانیبێژ سا تۆیش ئەم كەین و بەینە لە ئاوازێكی مۆسیقای سازدا ڕێكبخە.

٣.كە چی دڵی هەموو خەڵكتان ڕاو كردووە بە ڕەوشتی جوان و بەرزتان (ئەخلاقی حسن).

٤.بۆ هیچ ڕاوێك كەی پێویستتان بە تولە و تانجی بووە.

لە كاتی دەوڵەتی عوسمانیدا (طابور ئاخاس)یەك هەبووە ناوی (ضیاء) بووە تا بڵێی كابرایەكی ناڵەبار و دوڕو بەدڕەوشت بووە! ڕەفیق ئەفەندی دەرهەق بەو ئەم بەیتە شیعرەی بە توركی وتوە:

ساڵی سەگدر بو سەنە تقویمدە مستور در

طابور ئاخاسی ضیاء تقویمی تصدیق ایلدی

واتا ئەمسالْ سالْی سەگە و لە ڕۆژژمێردا (سالْنامە)دا وا نوسراوە. طابور ئاخاسیش تصدیقی ئەو سالْنامەیە دەکا بە ڕەوشتەکانی نالەبار و نارێکی بەرامبەر گەل.

خوالێخۆشبو مامۆستا عەلی ڕەفیق بۆیگێڕاینەوە وتی سالْح زەکی خاوەنی ڕۆژنامەی دیاری کوردستان کە لە سالْی (١٩٢٦ – ١٩٢٥)ز دەردەچو وتی لەو کاتەی کە لە چەمچەمالْ ئەفسەری سوپای عوسمانی بووم، دێرە هەلْبەستێکم لە زاری خەلْکییەوە بیست، بەلاّم بەلای من و چەند ئەفسەرێکی هاوڕێمەوە زۆر جوان و پەسەند بوو، بۆیە مەراقم بوو خاوەنەکەی بناسم، پاش پرسیارکردنێکی زۆر بۆم دەرکەوت کە هۆنراوەی ڕەفیق ئەفەندی (خادم السجاد)ەیە، هاتم بۆ لای و باسی ئەو بەیتە شیعرەم کرد و هەستی خۆمم بۆی ڕونکردەوە و هەر ئەمەش هەلێکی لەبار و هەلْکەوتو بوو بۆ ئەوەی ببینە هاوڕێ و دەستمانکرد بە بیروڕا گۆڕینەوە وەك ئەدەبدۆستێك.

پاش دەرچونی ڕۆژنامەی (دیاری کوردستان) لەلایەن سالْح زەکییەوە، ڕەفیق ئەفەندی هەلْبەستێکی نایابی کردە دەستی و هەستی خۆی بەرامبەر بە ڕۆژنامەکە دەربڕی لە ژێر ناونیشانی (دیاری بۆ دیاری کوردستان)و لە یەکێك لە ژمارەکانیدا بلاّوکرایەوە، مامۆستا ڕەفیق حیلمی وتبوی: (( من ئەم هەلْبەستەم بەلاوە زۆر جوان بوو، بۆیە لە کەشکۆلی تایبەتی خۆمدا لە ژێر ناویشانی هەلْبەستی هەلْبژاردە نوسیمەوە))، بەلاّم بەداخەوە ئێمە هەلْبەستەکەمان چاوپێنەکەوت و نەشمانزانی لە کام ژمارەی دیاری کوردستان بلاّو بووەتەوە.

بەلاّم لە ژمارە (١٩)ی دیاری کوردستان لە سالْی ١٣٤٣ کۆچی مامۆستا سالْح زەکی ساحێبقران باسێکی نایابی دەربارەی ژیان و هەلْبەستەکانی ڕەفیق ئەفەندی بلاّوکردۆتەوە لەگەلْ وێنەیەکی بە بەرگی مەلایانەوە (جبە و مێزەری لەبەربوو و ڕیشیشی داناوە). شایانی باسە مامۆستا ڕەفیق گەلێ چامە و دێرە هۆنراوەی هەیە، بە هەر چوار زمانەکە (کوردی، عەرەبی، تورکی، فارسی )، بەلاّم بەداخەوە تا ئێستا هەمویمانن دەستگیرنەبووە، بۆ نمونە ئەم چامەیە بە فارسی دایناوە دەلێ:.

گلەی لە بەختی خۆی ئەکا و پێییشی دلْخۆشە

زوو دستی زۆڵم چرخ بدڕەشت افتادە مەدهۆشم

سیاە بەختم پریشان روزگارم خانە بردۆشم

سیاە بختێ من با زولف دلبر نسبتی دارد

من از بختی سیاهی خۆیشتن زین ڕویی دڵخۆشم

تا دەڵێ:

ڕەفیقی ڕووسیە ڕا التفای گر کنی شاید

چوکمتر بندەیی از بندگانم حلقە درگۆشم

مامۆستا ڕەفیق نوێنەری کەرکوک دەبێ لە پەرلەمانی عیراق لە ساڵانی ( ١٩٢٤تا کۆتایی ساڵی ١٩٢٧ ) هەمیشە هەوڵی داوە و کۆششی کردووە بۆ خزمەتکردنی خەڵك و کاری باش، بۆیە زۆرجار توڕەبووە دژ بە کەموکوڕی و چارەسەرنەکردنی تەنگوچەڵەمە و زۆرداری دژی چەوسانەوە بووە... هەمیشە حەقبێژ و پاڵپشتی حەق بووە.

خۆی بە نوێنەری خەڵك و خەمخۆری گەل و شارەکەی زانیوە، هەروەك هاوڕێکانی مەلا مەجید کە قوتابی بەردەستی ڕەفیق بووە، هەروەها (شێخ محەمەد حەبیب و سەعید وەنداوی) کە هەردوکیان نوێنەری شاری کەرکوك بوونە لەگەڵ مامۆستا ڕەفیق دا دەگێرنەوە زۆر ئازا و چاونەترس و لێهاتو و زانا و شارەزا بووە، توانای وتووێژ و دواندن و بەرگریکردن بووە.

غیرەت و پیاوەتی ڕەفیق و لێبوردەیی:

شارەزایانی ژیانی ڕەفیق زۆر چاك دەزانن کەوا چاوتێر و نەترس و دەسبڵاو و بەخشندە بووە، هەمووکات حەزی بە پیاوەتی و ئیشی چاك کردووە، لەبەر ڕەزامەندی خوا دەگێرنەوە شەوێك دز دێتە سەر ماڵی ڕەفیق ئەفەندی یەکێك لە کورەکانی ڕەفیق دەست دەداتە تفەنگ و ڕانی دزە بریندار دەکا، بە برینداری دزە دەرباز دەبێ، بۆ ڕۆژی دوایی دزە مامۆستا ڕەفیق ئاگاداردەکاتەوە کەوا نەبونیی و هەژاری و بێکاری پاڵی پێوە نام بۆ دزی هاتمە لانەکەت شتێکم دەستکەوێ گوزەرانی پێبکەم، بەڵام لە جیاتی دەستکەوت برینداربووم و ئێستا لە پاڵەوە کەوتوم، بۆیە دوبارە ڕوم دەکەم لە دەرگاکەت و داوای یارمەتی دەکەم، ڕەفیق

ئەفەندی دەستبەجێ باری ئارد و هەروەها پزیشکی بە ناوبانگی ئەو سەردەمە (حەمە عەلی عەجەم) دەنێرێ بۆ تیمارکردنی تا برینەکەی چاکدەبێتەوە لە پاش ئەوەش هەمیشە یارمەتی دەدا و چاوی پێوەبوو ئیتر کابرا وازی لە دزی هێنا و ڕێگەی خراپەی بەردا و بوو بە مرۆڤێکی باش و خواناس.

ڕەفیق و قسە بە توێکڵەکانی (نوکتەبازی)

ڕەفیق ئەفەندی قسەزان نوکتەباز و قسەی لە جێی خۆیا بووە، دەڵێن یەکێك لە هاودەمەکانی خۆی (پیاوێکی ناودار و بەڕێز) نەخۆش دەکەوێت و ماوەیەك لە جێگا دەمێنێتەوە، ئەمیش دەچێتە دیداری هەواڵی دەپرسێ دەڵێ: ئێستا چۆنی ؟ باشتر بویتە ؟ بەڵێ : بەخوا کاك ڕەفیق هیچ باشتر نەبوومە، مەگەر درۆزن فەرقم پێ بکا ! ڕەفیق یەکسەر دەڵێ کەوا بوو هەر خۆت فەرقی پێ دەکەیت؟!

شایەنی باسە شاعیری گەورە و بەناوبانگی کەرکوك شێخ ڕەزای تاڵەبانی خاڵوانی بنەماڵەی (خادم السجادەیە) چونکە خوشکی شێخ ڕەزا باوەژنی ڕەفیق ئەفەندی بووە و هەمودەم شێخ عەلی باوکی شێخ ڕەزا بە حاجی ئەمین باوکی ڕەفیق ئەفەندی وتوە: (( من لە دونیا و قیامەتا فەخر و شانازی بە خزمایەتی ئێوەوە دەکەم و پێی شادمان))، ڕەزا و ڕەفیق نزیکی (٣٥) ساڵ وەك دۆست و خزم پێکەوە هەڵسان و دانیشتنیان هەبووە، بۆیە لە زۆربەی هەڵبەست و وشەکانیدا بۆنی هەڵبەست و وسەی شێخ ڕەزای پێوە دیارە، زۆرجار ویستویەتی خۆی لە قەرەی شێخ ڕەزا بدا و بەرپەرچی بداتەوە.

زۆر جار دەستەیەك ئەدیب و زانا و شاعیر و ئەدەبدۆست و کۆڕی ئەدەبییان سازکردووە، هەر ئەوەندە ڕێکەوتێك یا موناسەبەیەك ببوایە هەموو لە تەکیە و مەقامی (خادم السجادە) یا لە خانەقای سەید ئەحمەد یا لە تەکیەی تاڵەبانی یان لە ماڵی شێخ ڕەزا یا لای شێخ محمدی کەرەدانی بەرزنجی یا هەر شوێنێکی تر کۆدەبونەوە و کۆڕیان دەبەست، بە قسەی خۆش و نوکتە و هەڵبەستی جوان و ڕاگۆڕینەوە و لێکۆڵینەوە و لێدوان شەوگاریان بەسەردەبرد، ئەوانەی کە بناخەی کۆڕ یا بەڕێوەبەری کۆڕ بوون، ئەمانەن: سەید ئەحمەدی خانەقا کە یەکێك لە هەرە پیاوە ناودارەکانی کەرکوك بووە و خاوەن جێگا و مەقامی خۆی بووە، هەموو کەس دەستی لێزانی و پیاوەتی بۆ درێژ دەکا، سابری شاعیر

پورزای ڕەفیقە، دیوانە شیعرەکەی بەڵگەیە بۆ توانا و جێگا و مەرکەزی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی هەموو کەس دەزانێ چ کەڵەشاعیرێك بووە، کەس نەبووە لە زمانی نەترسێ، هەروەها عەبدولخالق ئەسیری، تائیر فوئاد، محەمەد خالس، شێخ کەریمی شۆرجە، مەلا عەلی حیکمەت، سیامەنسوری زانا شێخ محەمەد کەرەدانی بەرزنجی قازی ئەحمەد ئەفەندی قوتب، شێخ ڕەئووفی خانەقا کە ئەو کاتە لاو بووە و مەلا مەجیدی قوتب، لە سولەیمانییەوە زۆرجار مامۆستا بێخود و پیرەمێرد و عەلی کەمالی و لەهەولێرەوە مامۆستا مەلا فەندی بە ناوبانگە و جەبار ئاغاە کانی میوانداری پێیان کردوە بەشداری کۆڕ و دانیشتنیان بووە.

هەروەها مەلای گەورە (مەلا محەمەدی کۆیە)هاتوچۆیانی کردووە هەروەها دۆستایەتی بەتینیان بوە لەگەڵ ڕەشید عالی گەیلانی و یوسف عەتا موفتی عێراق و سەرۆکی زانایانی ئەوکاتە و شێخ موستەفا بەهجەت لە زانا بەرزەکانی (بصره)هەروەها دۆستایەتیان لەگەڵ رەسافی زەهاوی شاعیر و ماڵی نەقیب لی بەغدا و زۆر ناوداری تر.

## مام جەلال گووتویەتی:

(بەڕێزان.. هاوڕێیان.. تێکۆشەران .. ئێمە ئێستا لەسەر گۆڕی دوو تێکۆشەری دێرینی کوردین.. کە ماوەیەکی زۆر وەفاتیان کردووە، بەڵام جێگەی لای هەمووان دیارە و تێکۆشانیان وەك ڕۆژی ڕووناك بە بەری بێژەنگ ناگیرێ، یەکێکیان زەینەب خان ی کچی مەلا ڕەئوفی خوشکی دڵداری شاعیر و ئەوەی یدکەیان فازڵی کوڕی زەینەب خانە، لە ڕۆژگارێکدا دایك و کوڕ لە پێناوی خەباتی رزگاریخوازیی کورد کاریان کردووە، کە ئەو کات کورد هێندە چەکی مەعنەوی و ماددی نەبوو.

لە ڕاستیدا ئەو بنەماڵەیە خەباتی زۆریان بۆ کورد کردووە و دەبێ بە حەق بڵێچین ئێمە قەرزاری ئەو بنەماڵەیەین، ئەوان ڕووناکبیر و مونەوەری سەردەمی خۆیان بوون، لەو ڕۆژگارە تاریکەکاندا چەکی کوردایەتییان نەوی نەکردووە).

هەروەها لە باسی زەینەب خانی گوتی:

(زەینەب خان شێرە ژنێکی کوردە، تێکۆشەرێکی مەزن و گەورە بوو، هەرچی هەوڵ و تەلاقەی هەبوو لە پێناو کوردایەتی دای، هەروەها بە ماددی و مەعنەوی خزمەتی خەباتی ڕزگاریخوازیی کوردی کردووە، ئێمە لە نێو ئەو بنەماڵەیەدا ئەگەر بە حەق بێ لە هەمووان زیاتر قەرزارباری (زەینەب خان)یین، ئەوەی لە نزیکەوە ئەو شێرە ژنە دەرگای ماڵەکەی کراوە بوو بۆ کۆبوونەوەی کوردانی هەر چوار پارچەی کوردستان، هەروەها یارمەتیی ماددی گەلێ خەباتگێڕی کوردی داوە، پەیوەندیی لەگەڵ گەلێ تیکۆشەر و خەباتگێڕ هەبووە، لەبەر ئەوە ئێمە قەرزارباری زەینەب خانین، ئەو شێرە ژنە لەگەڵ خەبات و تێکۆشانی هەروەها شاعیرێکی ئاستبەرز بووە، نابێ هۆشیاری ژنێکی ئەوها تێکۆشەر لە بیر بکەین، کە لەو سەردەمەدا زۆربەی ژنانی کورد چەوساوە بوون، کەچی ئەو بە خەباتی و کۆڵنەدانی، خۆی چەسپاندووە، زەینەب خان تێکۆشەرێکی گەورە بوو، خەباتی وی هیچ کەمتر نییە لە خەباتی جەمیلە بوحێردی[1] جەزائیری، مە لە پێناوی ڕزگاری و ئازادی گەلی جەزائیر لە دژی ئیستعماری فەڕەنسی خەباتی نەپساوەی کردە بەرگریی هەڵبژارد، زەینەب خانیش هەتا ئەو کاتەی لە ژیاندا بوو، خەباتی بۆ گەلەکەی کرد.

هەر لەوێدا کە ڕەمزی کوڕی زەینەب خان حازر بوو، مام جەلال ڕووی لەو کرد و داوای لێکرد:

پێم باشە ئارامگای زەینەب خان و دڵداری برای نەقلی کۆیە بکرێن، هەتا لەوێ ئارامگەیەکی لایق بە هەردووکیان دروست بکرێ، تاکو تێکۆشەر و خەباتگێڕان سەری لێ بدەن و مێژووی نەفەوتێ.

*زەینەب خان- کچەکورد (١٩٠٠-١٩٦٣) ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری دارکەر و حزبی هیوا و کچە گەورەکەی مەلا ڕەئووفەفەندی. بیری کوردایەتی بووە، لە ماڵی خۆی زیاتر لە ١٢ هەتیوی گەورە کردووە و بەخێوی کردوون: لە

١جەمیلە بوحێرد: خەباتگێڕێکی ژنی جەزائیری بوو، ببووە ڕەمزی بەرگریی خەڵکی جەزائیری خاوەن ملیۆن شەهید دژی فەڕەنسای داگیرکەر و ئیستعمار، نەبەردییەکانی ئەو ژنە لە زاکیرەی گەلی جەزائیر و عەرەب لە بیر ناکرێن، (نزار قەبانی) شاعیر قەسیدەیەکی بەناوی خۆی بۆ داناوە و (وەردە جەزائیری گۆرانیبێژ) کردوویەتە گۆرانی.

